# بابه لاق درێژ

## نوسەر: وییستیر

### وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئەنوەر سوڵتان پەنا


◄ تایپ: هەڵۆ جانانی (هەڵۆی کوردستان)

◄ هەڵەگر: سەلاح سوڵتان پەنا

◄ بەرگ: هەرێم عوسمان

◄ چاپخانە: روون

◄ تیراژ:

◄ ژمارەی سپاردن:(٢٦٤٨)ی ساڵی ٢٠١٢ کتێبخانە گشتییەکانی سلێمانی پێدراوە

## چەند دێڕێك لەبارەی نووسەرەوە:

خاتوو "ئالیس جین چندلر ویبستیر"[1] نووسەری ئامریکایی کە دواتر بە "جین ویبستر"[2] بەناوبانگ بوو، لە ٢٤ی ژوورییەی ساڵی ١٨٧٤ی زایینی لە شاری نیویورك چاوی بە دنیا هەڵێناو ساڵی ١٩١٦ی زایینی هەر لە شاری نیویورك کۆچی دوایی کرد.

بابی "جین ویبستر" خاوەنی دەزگایەکی چاپو بڵاوکردنەوەی گەورە بووو دایکیشی خوشکی "مارك تواین"[3] نووسەری گەورەو بەناوبانگ بوو.

ئەو لە مەدرەسەی"جان گری"[4] لە شاری نیویورك دەستی بە خوێندن کردو پاشان لە کالێجی "واسار"[5] درێژەی بە خوێندن دا. چەندین سەفەری بۆ وڵاتانی جیهان کردو ماوەیەکیش لە وڵاتی ئیتالیا نیشتەجێ بوو.

"جین ویبستر" نووسەری چەندین کتێبی بەناوبانگ وەکوو "پاتیو پریسیلا"[6]، "تەنیا پاتی"[7]، "جێری خوێندکاری ساڵی سێیەم"[8]، "وایت

---

[1] Alice Jene chandler webster
[2] Jean webster
[3] Mark twein
[4] Jane Grey
[5] Wasar
[6] Petty and Prisella
[7] Just Patty
[8] Jerry

برینیس"[1] و چەند کتێبی بەناوبانگی دیکەیە.

کتێبی "بابە لاق درێژ" (ئەوەی ئێستا لەبەر دەستتان دایە)، یەکێک لە شاکارەکانی ئەو خاتوونەیە کە ناوبانگی جیهانی هەیەو یەکێك لەو کتێبانەیە کە هەردەم تازەیە، قەت کۆن نابێ و قەت فەرامۆش ناکرێ.

[1] The wheat Princess

## "چوارشەممەی شووم"

هەموو چوارشەممەکانی سەری مانگ، ڕۆژێکی بەتەواوی ترسناك بوو. ڕۆژێك بوو کە بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانیان دەکرد. بە وریایی و حەوسەڵە بەسەر کارەکاندا رادەگەیشتن و سەرەنجام بە ڕێکوپێکی کۆتاییان پێ دەهێنا. دەبێ تەختی ژوورەکان و دالانەکان بێ پەڵە، قەنەفەو کورسییەکان بێ گەردو خۆڵ و ڕووپۆشی قەرەوێڵەکان بێ چرچ و لۆچ بن. دەبێ نەوەدو حەوت منداڵی بچکۆلەی هەتیو کە بە نێو یەکدا هەڵدەچین، پاك و خاوێن ڕاگیرێن و سەریان شانە بکرێن. سەربەرگە کەتانیەکانیان لەبەر بکرێن، دوگمەکانیان ببەسترێن و هەرچەند دەقیقە جارێك وەبیریان بێنینەوە کە:

ـ هەرکات یەکێك لە باوەڕپێکراوان پرسیارێکی لێ کردن، بڵێن: بەڵێ گەورەم. یان نەخێر گەورەم. وشەی گەورەم قەت لەبیر نەکەن.

چونکوو "جیرۆشا ئابۆت"[1]ی بێوڵەت لە هەموو منداڵەکان بە تەمەنتر بوو، زۆربەی کارەکان کەوتبووە ئەستۆی ئەو.

سەرەنجام ئەم چوارشەممەیەش وەك هەموو مانگەکانی دیکە کۆتایی پێ هات و "جیرۆشا ئابۆت" کە هەموو دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بۆ میوانەکانی هەتیوخانە بابۆڵە (ساندویچ)ی ساز کردبوو، ماندوو شەکەت چووە نهۆمی سەرەوە تا بە کارەکانی ڕۆژانەی خۆی ڕابگا.

شوێنێك کە ئەو بەتایبەت پێی ڕادەگەیشت ژووری "ف" بوو. لەو ژوورەدا

---

[1] Jerusha Abbott

یـازده منـدالّی ٤ تـا ٧ سـالاّن لـەژێر چـاوەدێری ئـەودا بـوون. "جیرۆشـا" منداڵـەکانی ریـز دەکـردن کـەپۆی یـەك بـە یـەکیانی خـاوێن کـردەوە. جلوبەرگەکانیانی رێك‌و پێك کردن‌و هەروا بەریز ئەوانی بۆ ژەمـی شـێو هێنایـە هۆڵی نان خواردن. شێوی ئەوان لە نانی سپی، شیرو دەفرێك خۆشاو (کامپوت) پێك هاتبوو.

پاشان لە حاڵێکدا سەری بە توندی دەیێشاو گەرم داگیرسابوو، چووە کـەناری پەنجەرەو سەری بە شووشەکەیەوە لکاند. "جیرۆشا" لە کاتژمێر پێنجی بەیانیەوە بەملاو ئەولادا هەڵدەسووڕا، لەم‌و لەو دەستووری وەردەگـرت‌و پەسـا پەسـا چـزی زمـانی بەڕێوەبەری تووڕەو زۆر جیددیی هەتیوخانەی تەحەمول دەکرد.

خـاتوو "لیپـت"[1] لـە بەرامبـەر منداڵـەکانی هەتیوخانـەدا راسـت بـە پێچەوانەی ئەو ئینسانە دلۆڤان‌و نـەرم‌و نیانـە بـوو کـە لـەلای میوانـەکان خـۆی دەنواند.

"جیرۆشا" لە پشت پەنجەرەوە لە چیمەنی سەهۆڵبەسـتووی پـێش خانووەکـەی دەڕوانی‌و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

- تا ئەو جێگایەی بۆ من دەرکەوت کۆبوونەوەی ئەمڕۆ بە باشی بەڕێوە چـوو. دەستەی باوەڕپێکراوان‌و ئەو خاتوون‌و ئاغایانەی کە یارمـەتیی مـاڵییـان دابـوو، هـەموو شـوێنێکی هەتیوخانـەیان دیـت، راپـۆرتی مـانگانـە خوێندرایـەوە، بـە بابۆڵەو چای لە میوانەکان پەزیرایی کـراو دوای ئەمانـەش هـەموویان گەڕانـەوە مـاڵێ‌و پەنایان بردوە بەر زۆپای گەرم‌و ژوورە خۆشەکانی خۆیان، تا بۆ مـانگێـك مـنداڵە هەتیوەکان، کە سەرپەرەشتی‌و پەروەردەکردنی ئەوانیان وەئەستۆ گرتبوو،

---

[1] Lippet

لەبیر بەرنەوە. "جیرۆشا" هەروا بە تامەزرۆییەوە دەیڕوانییە ئەو ماشینانەی کە لە حەساری هەتیوخانە دەچوونە دەرێو لە جیهانی بیرو خەیاڵدا ئەوانی تا خانووە بەشکۆو جوانەکانیان کە لە داوێنی تەپۆلکەکاندا بوون، بەرێ دەکردن.

پاشان ئازایەتییەکی لە خۆیدا بەدی کردو لە جیهانی بیرو خەیاڵدا پاڵتۆیەکی خەزی لەبەر کردو کڵاوێکی مەخمەڵینی کە بە چەند پەڕی جوان رازابۆوە لەسەر نا، لە یەکێك لە ماشینە بەشکۆکاندا دانیشتو بە دەنگێکی ئارامو دڵنیا بە شۆفێری گوت:

- بەرەو ماڵی باژۆ

بەڵام لەگەڵ دەگەیشتە دەرکی ماڵ، وزەی بیرکردنەوەی زیاتر بڕی نەدەکرد چونکە "جیرۆشا" تا ئەوکاتە نێوماڵێکی بەشکۆی نەدیبووو بێجگە لە هەتیوخانە خانوویەکی دیکەی نەدەناسی.

"جیرۆشا" هێزی بیرکردنەوەی لە رادەبەدەر بوو تا ئەو جێگای کە خاتوو لیپت پێی وابوو ئەم هێزی بیرکردنەوەیە لە داهاتوودا تووشی چەرمەسەریی دەکا. لەگەڵ ئەوەی حەڤدە ساڵ لە تەمەنی تێدەپەڕی هیچکات پێی نەنابۆوە نێو خانوویەکی ئاساییەوەو نەیدەزانی کەسانی دیکە کە بە پێی یاسای هەتیوخانە نەژیاون ساتەکانی تەمەنیان چۆن لێ رادەبرێ.

"جیرۆشا"

"تۆیان دەوێ"

"لە ژووری دەفتەر"

"دەی زوو بە"

ئەمە دەنگی "تامی دیلۆن"[1] بوو کە بە پلیکانندا سەردەکەوت. لەگەڵ گەیشتنە نێزیك دەرگای ژووری "ف" "جیرۆشا" دەنگی ئەوی بیستو لە جیهانی بیروخەیاڵ هاتە دەرێ. لە کەناری پەنجەرەوە هەستاو ژیانی تفتو تاڵ بۆ جارێکی دیکە ئەوی بەرەو خۆی راکێشا. بە نیگەرانییەوە پرسی:

- چی بووە؟ کێ کاری بە منە؟

لە وەڵامدا بیستی:

- خاتوو "لیپت" تۆی دەوێ. لە دەفتەر دانیشتووەو زۆریش تووڕەیە. کاتێك کەسێك لە لایەن خاتوو "لیپت"ـەوە بۆ ژووری دەفتەر بانگ دەکرا، بێبەزەییی ترین منداڵی هەتیوخانە دڵی پێی دەسووتا.

ئەو هەواڵە دڵتەزێنە لە لایەن "تامی"یەوە راگەیەندرا کە بە نیگەرانییەوە لە "جیرۆشا"ی دەڕوانی. هەرچەند "جیرۆشا" دەستی تامیی گرت، بەرەو خۆی رایکێشاو کەپۆی بە توندی خاورێن کردەوە لەگەڵ ئەوەش تامی "جیرۆشا"ی خۆش دەویست.

"جیرۆشا" کشو مات بەرەو دەفتەری خاتوو "لیپت" وەڕێکەوت. چرچێك کەوتە نێوچاوانیو کەوتە دڵە خورپێ. بەخۆی گوت:

- چی قەوماوە؟ نانی بابۆڵەکان ناسك نەبووە؟ کێکەکان توێکڵی گوێزیان پێوە بووە؟ یەکێك لە خاتوونەکان کونی گۆرەویەکانی "سوزی"ی دیوە. ئەی خوایە گیان لەوانەیە یەکێك لە منداڵەکانی ژووری "ف" ناعالیی کردبێو لە لای یەکێك لە میوانەکان خۆی تەڕ کردبێ.

کاتێك "جیرۆشا" گەیشتە ئاخرین پلیکان، دوایەمین کەس لە میوانەکان لە

---

[1] Tommy dillon

بەرامبەر تەلارەوە تێپەڕی. تەنیا شتێك كە سەرنجی ئەوی راكێشا كەڵەگەتیی ئەو پیاوە بوو.

كابرای میوان كە پشتی لە "جیرۆشا" بوو دەستی بۆ یەكێك لە ماشینەكان هەڵێنا. ماشین هاتە پێشەوە، تیشكی چراكانی لە قەڵافەتی میوانەكە دراو سێبەرێكی راكشاوو درێژ لە قەڵافەتی ئەو پیاوە كەوتە سەر دیوارەكە.

"جیرۆشا" لەو لەحزەیەدا كە سێبەرەكەی بە دیوارەوە بینی، لەگەڵ ئەو هەموو دڵەڕاوكێو نیگەرانییەی كە هەیبوو دەستی بە پێكەنین كرد. هەر بۆیەش بە رەنگوڕوویەكی شادو دەم بە پێكەنینەوە لەگەڵ خاتوو "لیپت" بەرەڕوو بوو. سەیرتر لەوەش ئەوە بوو كە دیتی خاتوو "لیپت"یش رووخسارێكی شادو لەسەر كەیفی هەیە.

خاتوو "لیپت" گوتی:

ـ "جیرۆشا" دانیشە دەمەوێ لەگەڵت بدوێم.

"جیرۆشا" بە نیگەرانییەوە لەسەر یەكەم كورسی دانیشتو بۆ وتەكانی خاتوو "لیپت" چاوەڕوان مایەوە. لەو كاتەدا ماشینێك بە بەرامبەر پەنجەرەدا تێپەڕیو خاتوو "لیپت" چاوێكی لەو ماشینە كردو گوتی:

ـ تۆ ئەو پیاوەت دی كە ئێستا لێرە چووە دەرێ؟

ـ من لە پشتەوە دیتم، روخسارم نەبینی.

ـ ئەو یەكێك لە بە بڕشت ترینو دەوڵەمەندترین ئەندامی یارمەتیدەری هەتیوخانەیە. تا ئێستا یارمەتی زۆری بەم هەتیوخانە كردووە. دیارە من بۆم نیە ناوی ئەو بەڕێزە بێنم. زۆری راسپاردووەو دووپاتی كردۆتەوە كە نابێ ناوی بزانرێ.

چاوەكانی "جیرۆشا" زەقو زەقتر دەبوون. تا ئێستا رێنەكەوتبوو كە بۆ

دانيشتن بانگ بكرێته ژووری دەفتەرو لەبارەی تايبەتمەندیی ئەندام، يان دەستەی بڕوا پێكراوانی هەتيوخانە باسی لەگەڵ بكرێ.

خاتوو "ليپت" درێژەی بە قسەكانی دا:

ـ بەڵێ ... ئەم پياوماقووڵە سەبارەت بە چەند كەس لە كورەكان گەورەيی نواندووە. تۆ "چارلز بنيتون"[1] و "هينری فريز"[2] دەناسی؟ هەردووكيان ئەم جەنابەی كە قسەی لێ دەكەين ناردنيە زانستگەو ئەوانيش بەو هەوڵو تێكۆشانەی كە لە دەرس خوێندندا لە خۆيان نواند، هەموو خەرجو يارمەتييەك كە ئەو پياو ماقووڵە لە پێناوی ئەواندا بەختی كردبوو، قەرەبوو كردەوە. ديارە ئەم جەنابە بەرێزەش بێجگە لەوە چارەڕوانی شتێكی ديكە نيە. ئەو تا ئێستا سۆزی مرۆڤدۆستانەی خۆی سەبارەت بە كوڕان نيشان دەداو من تا ئەم دەمە نەمتوانيوە سەرنجی ئەو بۆ لای كەنيشكەكان رابكێشم. وا دەر دەكەوێ كە كچی خۆش ناوێ. لە كۆبوونەوەی ئەمڕۆدا باس لە تۆو چارەنووسی تۆ هاتە گۆڕێ.

خاتوو "ليپت" بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بوو. بەو بێدەنگييە "جيرۆشا" هەستی كرد كە كەوتۆتە ژێر نهێنی ئازارێكی دەروونيی گەورەوە. پاشان خاتوو "ليپت" درێژەی بە قسەكانی دا:

ـ بەڵێ ... ئێمە بە دەگمەن منداڵانی زياتر لە شازدە ساڵان لێرە رادەگرين. ديارە تۆ لەگەڵ هەموان جياوازيت هەيە. تۆ دەرسی فێرگەت لە تەمەنی چوارە ساڵیدا تەواو كردو لە دەرس خوێندنيشدا پلەی باشت دەهێنا. ئەڵبەت بە شێوەيەكی ئەوتۆش ناكرێ بگوترێ كە ئاكارو كردەوەت باش بووە... لەو شتانە بگەڕێين. ئەوە بوو سەرەنجام هاتينە سەر ئەو باوەڕە كە بتنێرينە قوتابخانەی گوند.

---

(1) Charles Benton
(2) Henry Freize

ئێستا دەورەی ناوەندیش لە تەواوبوون دایەو هەتیوخانە ناتوانێ خەرجی تۆ لە عۆدە بگرێ. چونکە تا ئێستا دوو ساڵ زیاتر لەوانی دیکە لێرە ماویەوە.

خاتوو "لیپت" لەبیری چوو یان نەیویست بیدرکێنێ "جیرۆشا" لە ماوەی ئەو دوو ساڵەداو لە بەرامبەر خەرجی مانەوەی‌دا، راست وەك کرێکارێك لەو هەتیوهانەیەدا کاری کردووە. هەموو کات کارەکانی هەتیوخانە لە پێش دەرس خوێندنیەوە بووەو تاقە رۆژێك بێکار نەبووە کە تەنیا بە دەرس خوێندنەوە خەریك بێ، بەڵکوو هەموو رۆژێك کار هەبووەو ئەو دەبا لە بەیانیەوە تا شەو هەڵسووڕێو کار بکا.

خاتوو "لیپت" لێی زیاد کردو گوتی:

ـ بەڵێ داهاتووی تۆ لە کۆبوونەوەکەدا هاتە گۆڕێو پەروەندەت کەوتە بەر توێژینەوە. لەو کاتەدا خاتوو "لیپت" چاوی لە "جیرۆشا" کرد کە هەموو لەشی کەوتە لەرزین.

بەڵێ... هەرچەند نمرەکانت زۆر باش بوون، لە وانەی ئینگلیسی‌دا دەرەجەی بەرزت هێنابوو خوشکە "پریچارد"[1] کە یەکێك لە ئەندامانی هەتیوخانەیە زۆری دیفاع لێ کردیو یەکێك لە نووسراوەکانی تۆی خوێندەوە کە لەبارەی "چوارشەممەی شووم"ـەوە نووسیبووت ـ ئەگەرچی بە بڕوای من نەدەبا لێت قبووڵ بکرێ کە لە باتیی قەدرناسیو سپاس لە هەتیوخانە کە تۆی گەورە کردووە، تیتاڵی بە چوارشەممەی سەری مانگان بکەی! دیارە ئەگەر نووسراوەکەت لایەنی زمان شیرینیو گەپنووسی تێدا رەچاو نەکرایە، من بەش بە حاڵی خۆم هیچ لێبوردنێکم سەبارەت بە تۆ نەدەبوو ـ بەڵام هەرچۆنێك بێ جەنابی ...

---

[1] Pritechard

مەبەستم ئەو بەڕێزەیە کە ئێستا چووە دەرێ، ئینسانێکی مەشرفخۆشە، هەر لەبەر ئەو نووسراوە سەیرو سەمەرەیەت دەیەوێ بتنێرێتە زانستگە.

"جیرۆشا" لە حاڵێکدا بە سەرسووڕمانەوە دەیڕوانی گوتی:

ـ زانستگە؟!

خاتوو "لیپت" بە نیشانەی ئەرێ سەری بۆ لەقاند.

ـ بەڵێ ... هەر بۆیە پاش ڕۆیشتنی میوانەکانی دیکە تەشریفیان هێنایە دەفتەر کە لەبارەی مەرجەکانەوە باس بکا. پێم وایە مەرجەکانی زۆر سەیرن. ئەو بەڕێزە وا دەزانێ هێزێکی بەرزی داهێنەری لە تۆدا هەیەو هەر بۆیەش دەیەوێ هەلومەرجێك پێك بێنێ کە تۆ بتوانی درێژە بە خوێندن بدەیو ببی بە نووسەر

ـ فەرمووتان نووسەر...؟!

"جیرۆشا" هەستی کرد خەو دەبینێ.

خاتوو "لیپت" درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ بەڵێ ئەو وای گوت. بەڵام لە داهاتوودا دەردەکەوێ کە پێشبینیەکەی بەڕاست دەگەڕێ یان نا.. مانگانەیەکی بۆ بڕیوەتەوە کە زۆر جێگای سەرنجە. من سەرم سووڕ دەمێنێ کچێك کە بە درێژایی تەمەنی پوولگیرفانی بە خۆیەوە نەدیوە چۆن دەتوانێ ئەو هەموو پارەیە خەرج بکا. تۆ تا کۆتایی هاوین لێرە دەمێنیەوە. بڕیار وایە خوشکە "پریچارد" بەو هەستی خۆشەویستییەوە کە سەبارەت بە تۆ هەیەتی بۆ چوونە زانستگە ئامادەت بکات.

خەرجی دەرس خوێندنو جێگاو ڕێگات ڕاستەوخۆ بە زانکۆ دەدرێو ماوەی ئەو چوار ساڵە کە لەوێ دەبی هەموو مانگێك ٣٥ دۆلار پوولگیرفانیت بەهۆی سکرتێری تایبەتیی ئەو پیاوە ماقووڵە بۆ ڕەوانە دەکرێو تۆش لە بەرامبەردا هەموو مانگێگ نامەیەك بۆ ئەو بەڕێزەرەوانە دەکەی. دیارە نامەی سپاسو

شتی وای ناوێ، چونکە ئەو لەجێ دا ئەو چەشنە کارانەی پێ خۆش نیە. بەڵکوو تۆ لە نامەکانتدا چۆنیەتیی وانەکان‌و سەرکەوتنی خۆتی بۆ دەنووسی. راست وەك ئەوە کە دایك‌و بابت هەیەو لەبارەی خوێندن‌و فێرگەوە نامەیان بۆ دەنێری. ئەو نامانە بۆ "جان ئیسمیت"[1] دەنووسرێ‌و بەهۆی سکرتێرەکەیەوە بۆی رەوانە دەکرێ. ناوی ئەو ئاغایە "جان ئیسمیت" نیە، بەڵام چونکە دەیەوێ نەناسرێ، بۆ تۆو نامەکانی تۆ ناوی "جان ئیسمیت"ی هەڵبژاردووە.

بەڵام بۆچی دەیەوێ نامەی بۆ بنووسی، چونکە پێی وایە هیچ شتێك وەك نامە نووسین ناتوانێ مرخ‌و شایستەیی نووسەر گەشەدار بکاو زاراوەی ئەدەبی‌و خەیاڵاوی پێ دەربڕێ. هەروەها چونکە تۆ دایك‌و بابت نیە نامەیان بۆ بنووسی، پێی خۆشە نامەی تۆی پێ بگا، بەڵام بەناوی "جان ئیسمیت"ـەوە. کە بەهۆی ئەو نامانەوە لە بەرەوپێشچوونی کاری دەرسخوێندنت ئاگادار بێ. ئەوەش بزانە کە وەڵامی نامەکانت پێ ناگاتەوە. ئەگەر کارێك بێتە پێشێ کە پێویستی بە وەڵامدانەوە هەبێ، بۆ نموونە ئەگەر خوانەخواستە لە زانستگە دەرت بکەن، دەبێ ئەو شتە بە سکرتێرەکەی، واتە بەرێز "گریگز" رابگەیەنی. بەکورتی نامەنووسینی مانگانەی تۆ زۆرە ملێ (ئیجباری)یەو ئەوە تەنیا کارێکە کە دەتوانی بەهۆی ئەو کارەتەوە قەدرناسیی خۆتی پێ رابگەیەنی. ئەم کارەت وەك ئەوەیە قیستی مانگانەت دەدەیەوە. هیوادارم کە لە تەواوی نامەکانتدا ئەوپەڕی رێز پێشکەش بکەی‌و بیسەلمێنی کە پەروەردەو فێرکردنی تۆ درووست بووەو ئەوەشت لەبیر نەچێ کە نامە بۆ یەکێك لە باوەڕپێکراوانی هەتیوخانەی "جان گریر"[2] دەنووسی.

---

[1] Jon Smith
[2] John Grier

"جیرۆشا" بە دنیایەك ئارەزووەوە لێی ورد دەبۆوە. دەیوست لەوێ هەڵێ. پێی خۆش بوو پەنا بەرێتە بەر قوژبنێك‌و بیر بكاتەوە.

هەستاو هەنگاوێك كشایەوە. بەڵام خاتوو "لیپێت" بە ئاماژەی دەست ئەوی ڕاگرت‌و وتی:

- هیوادارم سەبارەت بەو چارەنووسە كە ڕووی تێ كردووی شوكری خوا بكەی. ئەم چەشنە چارەنووسانە كە بۆ كچێكی وەك تۆ دێتە پێش كە لە پڕ دەرگای سەركەوتن‌و بەختەوەریی لێ بكرێتەوە لەبیرت بێ ... "جیرۆشا" قسەكانی پێ بڕی‌و گوتی:

- بەڵێ ... ڕاست دەفەرموون خاتوون. زۆرت سپاس دەكەم. ئێستا ئیزنم بدە بڕۆم پانتۆڵەكەی "فریدی پیركینز"[1] پینە بكەم...

"جیرۆشا" وەك برووسكە لە ژوور هاتە دەرێ‌و دەركەی پێوەدا. ئەمە لە حاڵێكدا بوو كە خاتوو "لیپێت" بۆ درێژەدان بە قسەكانی دەمی هەروا كردبۆوە.

---

[1] Freddie Perkins

# نامەکانی جیرۆشا ئابۆت
# بۆ
# بەڕێز بابە لاق درێژ

## ٢٤ی سێپتامبر ـ تەلاری "فیرگوسێن"[1]

## بۆ ئەو بەرێزەی کە هەتیوەکان دەنێرێتە زانکۆ

ئێستا من لێرەم. دوێنێ چوار کاتژمێر لەناو شەمەندەفەردا بووم. هەستێکی جێگای پێکەنینم هەبوو. چونکە تا ئێستا سواری شەمەندەفەر نەببووم.

زانکۆ جێگایەکی گەورەیەو بۆتە هۆی حەپەسانم. هەرکات لە ژوورەکەم دێمە دەرێ وا دەزانم ون بووم‌و بە پەلە دەگەڕێمەوە ژوورەکەم. کاتێک لەم گێژی‌و سامگرتووییە رزگار بووم، لەبارەی چۆنیەتی‌و هەلومەرجی ئێرە بە درێژی بۆت دەنووسم. ئێستا ئێوارەی شەممەیەو وانەکان بەیانیی دووشەممە دەست پێ دەکەن. دوایە لەبارەی وانەکانەوە نامەت بۆ دەنووسم. ئێستا دەمەوێ بۆ ئەوەی لەگەڵت ئاشنا بم چەند دێڕێک رەش کەمەوە.

نامە نووسین بۆ کەسێک کە تا ئێستا نە دیومەو نە دەیناسم جێگای پێکەنینە. بەگشتی لەم نامە نووسینە سەرم سوورِ دەمێنێ. من تا ئێستا کەسم نەبووە کە نامەی بۆ بنووسم. کەوابوو ئەگەر نامەکانم لە ئاستێکی بەرزدا نین داوای لێبووردنت لێ دەکەم.

دوێنێ کاتی رێکەوتنم بۆ زانکۆ "خاتوو لیپیت" کۆبوونەوەیەکی دوورو درێژی لەگەڵم پێک هێنا. دەبێ بڵێم لەو کۆبوونەوەیەدا ئەرکەکانی تا دوایەمین

---

[1] Fergussen

ڕۆژەکانی تەمەنم ڕوون کردەوە. بۆ نموونە ڕەفتاری منی بەرامبەر بەو بەڕێزە کە ئەو میهرەبانییەی لەگەڵ کردووم دیاری کردو بۆ چەندومین جار دووپاتی کردەوە کە "ئەوپەڕی ڕێزی بۆ دانێم".

بەڵام بەخوات سوێندت دەدەم، چۆن دەتوانم ڕێز لە کەسێك بگرم کە ناوی خوازراوی "ئیسمیت"ی لەسەر خۆی داناوە. ئاخر "ئیسمیت" بوو بە ناو؟ بۆچی ناوێکت بۆ خۆت هەڵنەبژارد کە شیاوی کەسێکی وەکوو تۆ بێ؟

من بە درێژی تەمەنم بێدایكو باب بووم. لەپڕ کەسێك پەیدا بوو کە چارەنووسو دادێی منی بەلاوە گرینگ بێ. هەر بۆیەش تەواوی ئەم هاوینە بیرم لە تۆ دەکردەوە. بە بیرمدا دەهات کە ئێستا خاوەنی بنەماڵەمو پەیوەندیم بە کەسێکەوە هەیە. ئەو بیرو خەیاڵە ئارامیم پێ دەبەخشێ، بەڵام مەڵێ بیرو خەیاڵم لەبارەی تۆوە زیاتر لەوە ناتوانێ لە شەقەی باڵ بدا. من تەنیا سێ شت لە تۆ دەزانم:

١ـ پیاوێکی کەڵەگەتی

٢ـ دەوڵەمەندی

٣ـ کچانت خۆش ناوێ

ئەگەر لەمە بەدوا نامەکانم ئاوا دەست پێ بکەم کە: "گەورەی دلۆڤانێك کە کچانت خۆش ناوێ" وا دەزانم تەوهینم پێ کردبێ. ئەگەر بنووسم "بۆ بەڕێزی دەوڵەمەندی دلۆڤان"، ئەمەش لای تۆ پەسەند نیە وای لێ دێ کە پارە لە هەموو شت گرینگترە. بێجگە لەوەش چۆن بزانین دەوڵەمەندێك تا دوایی تەمەنی هەروا ساماندار دەمێنێتەوە. کەوابوو تەنیا شتێك کە مسۆگەرە ئەوەیە کە تۆ خاوەنی لاقو لەتەرێکی درێژیو هەموو کاتیش هەروا دەمێنێتەوە. لەو ڕووەوە من بڕیارم داوە پێت بڵێم "بابە لاق درێژ". هیوادارم لێم زیز نەبی. ئەم گاڵتەیە هەر

له نێوان خۆماندا دەبێ‌و به خاتوو "لیپت"یش نالێین.

دوو دەقیقەی دیکه زەنگی سەعاتی ده لێدەدرێ. کاری ئێمه خواردن، خەوتن‌و ئاماده بوون لەسەر کەلاسی دەرسه که هەموو ئەوانه بەهۆی زەنگەوه رادەگەیەندرێ. به گران تەحەمول دەکرێ. هەست دەکەم هەمیشه وەك ئەسپ لەکاردام. کات روو له تەواوبوونه. چرا کوژایەوه! شەو باش. بزانه چەند به وردی یاساکان بەرێوه دەبەم. ئەمەش لەسەر بناغەی ئەو راهاتنانەیه که له هەتیوخانەی "جان گریر" دیتوومه.

لەگەڵ رێزو سلاو

جیرۆشا ئابۆت

بۆ بابە لاق درێژ "ئیسمیت"

یەکەمی ئۆکتۆبر

بابە لاق درێژی ئازیز

زانکۆم خۆش دەوێ بەڵام خۆشەویستر لە هەمووکەس‌و هەموو شتێك ئەتۆی کە منت ناردە زانکۆ. ئەوەندە لەسەر کەیفم کە لەخۆشیان خەوم لێ ناکەوێ. نازانی ئێرە لەگەڵ هەتیوخانەی "جان گریر" چەندە جیاوازە. تەنانەت لە خەویشدا نەمدەدی جێگایەکی وا لەم جیهانەدا هەبێ. دڵم بەو کچانە دەسووتێ کە ناتوانن بێنە ئەم زانکۆیە. دڵنیام ئەو زانکۆیە کە تۆ لە کاتی لاوی‌دا دەرست لێ خوێندووە وەك ئێرە خۆش نەبووە.

ژوورەکەی من لە بینایەکی بورج ئاسادایە کە پێش بینای زانستگە درووست کراوە. سێ کچ لە ژووری تەنیشت دیوەکەی من دان. یەك لەوانە لە ساڵی ئاخری زانکۆدا دەرس دەخوێنێ. چاویلکە لە چاو دەکاو لە پەسا دەڵێ: "منداڵەکان تکاتان لێ دەکەم کەمتر بە دەنگی بەرز قسان بکەن". دوو کەسەکەی دیکە کە لە ساڵی یەکەمی دەرس خوێندندان، یەکیان ناوی "سالی مەکبراید"[1]ـەو ئەوی دیکەیان ناوی "جولیا روتلیج پندلتون"[2]ـە.

"سالی" کیژێکی قژ خورمایی‌یە. لووتی کەمێك ئامال بەرزە. بەراپەرو

---

[1] Salie Mcbride
[2] Juli Rutledge Pendlton

هەڵسووڕو هەر لەو حاڵەدا دڵپاک‌و ساکارە. "جولیا" لە بنەماڵەیەکی سەربەدەرەوە بووو دەوڵەمەندەو لە نیویورکەوە هاتووە کە هێشتا بە تەواوی لەگەڵ من ئاشنا نەبووە. هەرچەند بەو خوێنکارانەی کە ساڵی یەکەمی دەرس خوێندنیانە کەمتر ژووری تاکەکەسی دەدەن، نازانم بۆچی بێ ئەوەی خۆم داوا بکەم ژووری تاکەکەسییان داومێ. ڕەنگە بەرپرسی ئەو کارە نەیویستووە خاوەن دایك‌و بابەکان لەگەڵ کچێکی هەتیو کە لە هەتیوخانەدا گەورە بووە، لە ژوورێکدا بژین. وا دیارە هەژاریش خۆی بارباییەکە[3] . ژووری من لە بەشی باکووری ڕۆژئاوادایە. دوو پەنجەرەی هەیە، لەو پەنجەرانەوە بەرجەوەندێکی جوان بەدی دەکرێ. دیارە کچێکی ١٨ ساڵان کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ بیست کچی دیکە لە ژوورێکدا نووستبێ، بەلایەوە زۆر سەیرە کە ئێستا بە تەنیا خۆی خاوەنی ژوورێکە.

ئەمە یەکەمین جارە کە توانیومە لەگەڵ "جیرۆشا" تەنیا بم‌و بە باشی بیناسم. وا دەزانم خۆشم لێی دێ. ئەی تۆ بابە؟؟

سێ‌شەممە

زانکۆ دەیەوێ لە خوێندکارانی ساڵی یەکەم، تیپی بەسکێتباڵ پێك بێنێ‌و لەوانەیە من هەڵبژێردرێم. من کیژێکی بەژن زراوم بەڵام زۆر وریاو هاروهاجم. کاتێك هەموان سەر بەرەوژوور دەڕوانن‌و بەشوێن تۆپدا بەملاوو ئەولادا رادەکەن، من بەنێو لاقیاندا هەڵدێم‌و تۆپەکە دەقۆزمەوە. خۆڕاهێنان لە گۆڕەپانێکی

---

[3] باربایی: ئیمتیاز

وەرزشدا کە دەوروبەری دارو درەختەوە بۆنی خۆرگەستووی گەڵازەردو سوورەکان لە هەوادا بڵاو بۆتەوە، حۆی دنیایەکە.

دەنگی پێکەنین‌و قیژەو هەرا لە هەموو سووچێکەوە دەبیسترێ. ئەمە دەنگ‌و هەرای ئەو کچانەن کە دەیانبینم‌و من لە هەموویان بەختەوەرترم.

مەبەست لە نووسینی ئەم نامەیە ئەوە بوو کە لەبارەی خوێندن‌و کەلاسی دەرسەوە هەندێ شتت بۆ روون بکەمەوە. دیارە خاتوو "لیپت" دەیگوت کە تۆ پێت خۆشە لەو شتانە ئاگادار بی. بەڵام بە داخەوە زەنگیان لێداو تا چەند خولەکی دیکە دەبێ جلی وەرزش لەبەرکەم‌و لە حەوشی زانکۆ ئامادە بم.

دوعام بۆ بکە لە تیپی بەستێکباڵدا هەڵبژێردرێم

بچووکی هەتاهەتاییت

جیرۆشائابوت

پاشکۆی نامە ـ (کاتژمێر ۹) ـ هەر ئێستا "سالی مەك براید" سەری کێشا ژوورەکەم‌و گوتی:

ـ ئەوەندەم بیری دایك‌و بابم کردووە لەوانەیە دیق بکەم. تۆش وای؟

بە زەردەخەنەیەکەوە گوتم:

ـ چ دەکرێ دەبێ بساچێنین.

دڵتەنگ بوون بۆ بنەماڵە جۆرە نەخۆشینێکە کە من قەت تووشی نابم. چما کەسێك بۆ هەتیوخانەو خاتوو "لیپت" دڵی تەنگ دەبێ؟

دەی ئۆکتۆبر

بابە لاق درێژی خۆشەویست

داخۆ لەبارەی "میکل ئانژ"[1] ـەوە شتێکت بیستووە؟

ئەو نیگارکێشێکی بەناوبانگی ئیتالیە کە لە چەرخی ناوەڕاستدا ژیاوە. هەموو خوێندکارانی زانکۆی ئەدەبیاتی زمانی ئینگلیسی زۆر باشی دەناسن. بەڵام کاتێك لای من ناویان هێنا پێم وابوو دەبێ فریشتەیەکی زۆر گەورەو مەزن بێ. هەموو خوێندکاران دایانە پڕمەی پێکەنین. یەکێك لە گیرو گرفتەکانی زانکۆ ئەوەیە کە لە زانکۆدا دەیانەوێ مرۆڤ هەموو شتێك بزانێ. تەنانەت ئەو شتانەی کە تا ئێستا ناویشت نەبیستبوون، بەڵام من ئێستا فێر بووم چی بکەم.

هەرکات خوێندکارەکان لەبارەی شتێکەوە دەدوێن، کە من نایزانم، لەو دەمەدا هیچی لێ ناڵێم. پاشان دەچم لە کتێبی زانیاری گشتی‌دا دەیدۆزمەوەو فێری دەبم. رۆژی یەکەم هەڵەیەکی سەیرو سەمەرەم کرد. کەسێك هەروا بە رێکەوت ناوی "موریس میترلینگ"ی هێنا. من بێ راوەستان پرسیم:

- لە قوتابییانی ساڵی یەکەمە؟

سەعاتێکی بەسەردا تێ نەپەڕیبوو کە خوێندکارانی زانکۆ بەو شتەیان زانیبووو هەموویان پێ دەکەنین.

---

[1] Michael Angelo

هەرچۆنێك بێ وا دەزانم لە مرخ و هۆشدا لە هیچکەس نەماوەمەوە. تەنانەت جاروبار پێم وایە زیاتر لە هەندێ کەس دەزانم.

پێت خۆشە بزانی موبلمانی ماڵەکەم چۆنە؟ رەنگی زەردو قاوەییم تێکەڵ کردووە. رەنگی ژوورەکەم ئێستا زەردی "گینۆیی"یە. پەردەو پاڵپشتەکانم لە رەنگی زەرد هەڵبژاردووە. مێزێکی بلاَّلوکی (کە دەستی دووەمەو لە هەراجیم کڕیوە بە یەك دۆلار) و کورسی‌یەکەی لە داری "ماهوون"و قاڵیچەیەکی قاوەیی، کە ناوەڕاستەکەی پەڵەیەکی جەوهەری پێوەیە، لە ژوورەکەم دان. کورسی یەکەم بە جۆرێك لەسەر ئەو پەڵە جەوهەرە داناوە کە دەرناکەوێ. پەنجەرەکان زۆر بەرزن. بە شێوەی ئاسایی دەرەوەیان لێ دەر ناکەوێ. بۆ ئەوە بتوانم دەرەوە ببینم، ئاوێنەی مێزی ئارایشەکەم کردۆتەوە. مێزەکە دەکێشمە بەر پەنجەرەو هەرکات بهەوێ پێدا سەرکەوم، کەشەوی مێزەکە دەردێنم و وەك پلیکان کەڵکی لێ وەردەگرم. بێ دەردی‌سەر.

"سالی" بۆ کڕینی کەل و پەل یارمەتی دام. هەرچۆنێك بێ سالی لە بنەماڵەیەکی رێکوپێکدا گەورە بووەو لەو کارانە باش دەزانێ. تۆ تەنانەت ناتوانی هەستیشی پێ بکەی کە کڕینی شتومەك بۆ من چ تامێکی هەیە. کەیف بەوە دەکەم کە پێنج دۆلاری‌یەك بدەم و باقییەکەی وەربگرمەوە. تا ئێستا هیچ کات لە پێنج سێنت زیاترم نەبووە.

ئای بابەگیان چەندە باش قەدری مانگانەکەم دەزانم.

هەرچەندە "سالی" کچێکی بەزمی و مەشرەفخۆشە "جولیا" راست بە پێچەوانەی ئەوە. من سەر لەوە دەرناکەم کە خانمی بەرپرس لە هەڵبژاردنی هاوژوورەکاندا بۆچی ئەوەندە کەمسەلیقە بووە. "سالی" بە هەموو شت پێکەنین دەیگرێ بەڵام "جولیا" زۆر زوو وەڕەزو بێحەوسەلە دەبێ، دەکشێتەوەو لەگەڵ

کەسدا ڕێك ناکەوێ. وا دەزانێ هەرکەس ناوی "پندلتۆن"ـە کاری تەواوەو جێگای لە بەهەشت دایە.

پێم وایە من و "جولیا" هەر لە یەکەم ڕۆژەکانمانەوە بۆ دژایەتی یەکتر درووست کراوین. بەڵێ ... دڵنیام ئێستا چاوەڕوانی لەبارەی وانەکانمەوە بۆت بنووسم.

وانەکان بەم چەشنەی خوارەوەن:

١ـ وانەی لاتین شەڕی "هانیبال" دژی ڕۆم و پاشەکشەی ڕۆمیەکان.

٢ـ وانەی فەرانسە، ٢٤ لاپەڕە کتێبی "سێ تفەنگدار"، سەرفی سێیەم کەسی کردارە بێ قاعیدەکان.

٣ـ وانەی ئەندازیاری، باسی "ئوستوانە"مان تەواو کردووەو گەیشتووینەتە باسی "مەخروتات".

٤ـ وانەی ئینگلیزی، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوە (شەرح و تەفسیر).

٥ـ وانەی فیزیولوژی. گەیشتووینە "دەستگای هازیمە"، "کیسەی سەفرا"، "لەوزولمەعدە"

بەرەو دەرس خوێندن!

جیرۆشائابوت

پەراوێزی نامە:

هیوادارم قەت خواردنەوەی ئەلکولی نەخۆیتەوە. ئەلکول دوژمنی سپڵ (کەبەد)ـە.

چوارشەممە

بابە لاق درێژی خۆشەویست

من ناوی خۆم گۆڕیوە.

دیارە لەو لیستەدا ناوم هەر "جیرۆشا"یە بەڵام هەموان بەناوی "جوودی"[1] بانگم دەکەن. هێشتا بە ناوە تازەکەم "جوودی" رانەهاتووم. "فیردی پیرکنیز" ئەو ناوەی لەسەر داناوم، دیارە پاش ئەوەی کە زانی ناوەکەم بە باشی بەسەر زمانی دا نایە. بریا خاتوو "لیپیت" لە دانانی ناوی منداڵەکاندا ئەقڵێکی زیاتری بەکار دێنا. من دڵنیام ئەو ناوانە لەڕووی دەفتەری تەلەفۆنەوە هەڵدەبژێرێ. ئەگەر پێت وا نیە هەر ئێستا دەفتەری تەلەفۆنەکەت تماشا بکە. لە لاپەڕەی یەکەمدا نووسراوە"تابوت" دیارە ناوی بچووك بە هەموو جێگایەك دەتوانێ هەڵبژێرێ. لەوانەیە "جیرۆشا"ی لەڕووی بەردەنووسی گۆڕستانەکانەوە وەرگرتبێ. من هەمووکات لەو ناوە بێزم هەستاوە بەڵام "جوودی"م پێ خراپ نیە، ناوێکی خۆشە. هەرچەند وا بیر دەکەمەوە کە "جوودی" دەبێ ناوی کچێکی چاوشینی نازپەروەردە بێ، واتە کچێك کە هەموو ئەفرادی بنەماڵە نازی بکێشن. کچێك کە لە ژیانیدا پەژارەی نەبووبێ.

بەڵام من هەر کەموکوڕییەکم هەبێ، لانیکەم کەس ناتوانێ بڵێ بەنازو بیانووگرم. هەرچەند لە بەینی خۆماندا بمێنێتەوە پێشم ناخۆش نیە جاروبار لە

---

[1] Judy

روالەتدا خۆم وەك كچێكی نازدار نیشان بدەم. كەوابوو تكات لێ دەكەم تۆش لە داهاتوودا بەناوی "جوودی" بمناسە.

هەواڵێكی دیكەشم پێیە بۆ ئەوەی بێخەبەر نەبی بۆتی دەنووسم. سێ جووت دەستكێشی چەرمم كڕیوە. پێش ئێستا لەو دەستكێشانەم بوو كە پێنج قامكیان نیەو منداڵان لە دەستی دەكەن. ئەوەشم لە داری جێژنی "نۆبێل" كردبۆوە. یانی تا ئێستا دەستگێشی ڕێك و پێك و باشم نەبووە. هەر نیو كاتژمێر جارێك لە كشەوی مێزەكەم دەریان دێنم و لە دەستیان دەكەم. زۆر دانم بە خۆمدا گرت تاكوو توانیم لەسەر كلاسی دەرس نەیانكەمە دەستم. (زەنگی ژەمی شێو لێدرا خوات لەگەڵ).

هەینی:

بابەگیان بیری لێ بكەوە. مامۆستای زمانی ئینگلیسی پێی گوتم كە دوایەمین نووسراوەكەم بەرزو بێ وێنە بووە. باوەر بكە دەقی رستەكەی ئەوەیە: "بەرزو بێوێنە". بەو فێربوون و بارهێنانەی كە بە درێژی ۱۸ ساڵان هەمبووە دەبێ سەركەوتنی وەها زۆر جێگای سەرنج بێ. وا نیە بابە؟ (هەروەكوو ئاگاداری و خۆیشتان لەسەر ئەو رایەن) كە ئامانجی هەتیوخانەی "جان گریر" ئەوە بوو، ۹۷ هەتیوی بێدایك و باب وەك ۹۷ منداڵی یەكسان و یەكجۆر پەروەردە بكا، بێئیرادەو بێ هێزی داهێنەری.

مرخ و لێهاتوویی من لە بواری نیگاركێشیدا لەو لەحزەوە هەڵی دا كە لەسەر دەرگاكان دەستم كرد بە كێشانی وێنەی خاتوو "لیپت" ئەویش بە گەچی تەختەرەشی فێرگە. تكات لێ دەكەم لەوەی كە دەمهەوێ لە هەتیوخانەی سەردەمی منداڵیم رەخنە بگرم، لێم زیز نەبی. ئەگەر دەزانی بە پێچەوانەی

ڕاستییەکان ناوی دێنم، بێڕاوەستان پارەی مانگانەکەم لێ ببڕە. دیارە ئەمە ئەوپەڕی بێئەدەبییە، بەڵام لە هەرحاڵدا نابێ چاوەڕوانی ئەدەبو خانومانیت لە کەسێك هەبێ کە لە هەتیوخانەدا گەورە بووە.

بەڕاستی بابە! ئەوەندە کە ڕابواردن لە زانکۆ ئازارم دەدا دەرسەکان ئەوەندە گران نین. زۆر جار نازانم کچەکان چی بە یەکتر دەڵێنو بە چی پێ دەکەنن. گاڵتەکانیان پێوەندی بە ڕابووردووەوە هەیە. ڕابووردوویەك کە هەموویان لێی ئاگادارن بێجگە لە من.

جاروبار هەست دەکەم لە جیهانێکی بێگانەدا دەژیم. هەموو شتێکم لا نامۆیەو لە زمانی خەڵکی ئەم دنیایە تێناگەم. ئەو مەسەلەیە زۆرم ئازار دەدا.

ئەو کاتانەی لە قوتابخانەی ناوەندی دەرسم دەخوێند پۆل پۆل کچەکان لە دەوری یەك کۆدەبوونەوەو بە سەرسووڕمانەوە لە منیان دەڕوانی. وێدەچوو هەموویان دەزانن کە لەگەڵیان جیاوازیم هەیە. وەك ئەوە ناوی "جان گریر" لەسەر هەموو ئەندامەکانی لەشم نووسرابێ. هەندێك لەوانە کە دەیانویست خۆیان میهرەبان نیشان بدەن، دەهاتنە لامو زۆر بە ئەدەبەوە لەگەڵم دەدوان، چەندەیان لێ بێزار بووم. تووكو نەفرەتی من زیاتر لەو کەسانە بوو کە دەیانویست بە ڕواڵەت خۆیان بە دلۆڤانو خێرەومەند بنوێنن.

بەڵام بابە لێرە هیچکەس نازانێ کە من لە هەتیوخانەدا بوومو منداڵی سەرەڕێم. بە "سالی"م گوتووە دایكو بابم مردوونو پیاوێکی بەساڵاچوو ناردوومیە زانکۆ. دیارە درۆشم نەکردووە. لەوەی کە پێم خۆشە وەك کچەکانی دیکە بم، نابێ بە لەخۆباییم بزانی. هەرچۆنێك بێ بیرەوەری سەردەمی منداڵیو ژیان لە هەتیوخانەی "جان گریر" کە دەورووبەریان گەمارۆ داوم، لە نێوان منو ئەواندا جیاوازییەك پێك دێنێ.

ئەگەر بتوانم بەسەر ئەو بیرەوەرییانەدا زاڵ بم، ئەو کاتەیە کە دەتوانم وەك کچەکانی دیکە بم. وا نازانم لەباری مەعنەویو دەروونییەوە لەگەڵ ئەوان جیاوازیم هەبێ. تۆش پێت وا نیە؟ لە هەرحاڵدا "سالی" ئێستا منی خۆش دەوێ.

ئەو کەسەی کە بۆ هەتا هەتایی خۆشی دەوێی

"جوودی ئابوت"

بەیانیی شەممە

هەر ئێستا بە نامەکەدا چوومەوە. زۆرم خەماوی هاتە بەرچاو. بەڵام لە کەسێك کە بەیانیی دووشەممە تاقیکردنەوەی هەیەو دەبێ بە وانەکانی ئەندازیاریدا بچێتەوە، هەڵامەتی گرتووە، پەسا پەسا لووتی دەسڕێو دەپژمێ، نابێ لەوە زیاتر چاوەڕوانیت هەبێ.

یەکشەممە

دوێنێ لەبیرم چوو نامەکە بدەم بە "پۆست" ئێستا پەراوێزێکی لێ زیاد دەکەم.

ئەمڕۆ قەشەیەك ئامۆژگاری دەکردین. دەزانی چی دەگوت:

حیکمەتێکی گەورە کە ئینجیل فێری ئێمەی دەکا ئەوەیە "هەژاران بۆیە درووست کراون تاکوو بە خەڵکی دیکە ماوەو هەلی خێرەومەندیو کاری چاك بدرێ"!

دەبینی؟ وەك ئەوە هەژارانیش ئاژەڵێکی ماڵیی بەکەڵکن. ئەگەر ئێستە من خانمێکی بەئەدەبو رووناکبیرم لێ دەرنەچووبا، هەڵدەستامو پاش تەواوبوونی دوعاکان خراپم بەسەر دەهێنا.

**٢٥ی ئۆکتۆبەر**

**بابە لاق درێژی خۆشەویست**

من بۆ دەستەی بەستێکبالّی زانکۆ هەڵبژێردرام. بریا دەتبینی سەرشانم چۆن رەش هەڵگەراوە. "جولیا" زۆری هەوڵ دا لەو تیپەدا هەڵبژێردرێ بەڵام نەکرا... دەبینی چ بەڵایەکم لێ دەرچووە. خوایە چەندەم پێ خۆشە.

زانکۆ رۆژ لە دوای رۆژ باش‌و باشتر دەبێ. کچەکان، مامۆستاکان، ژوورەکانی دەرس خوێندن، باخی زانکۆو هەموو خواردەمەنیەکانم خۆش دەوێ. لە حەووتوودا دوو جار بەستەنیمان هەیەو هیچ کاتێک بەیانیان گەنمە کابەی برژاو ناخۆین. لەوە زیاتر چم لە خوا دەوێ؟ بریار وابوو لە مانگێکدا تەنیا یەك نامەت بۆ بنێرم... بەڵام ئێستا هەرچەند رۆژ جارێك چەند لاپەڕە کاغەزم بۆ رەش کردوویەوە. چونکە هەر لەحزەو هەر رۆژ کە رادەبرد شتی تازەم دەدی‌و رووداوی وام دەهاتە پێش کە حۆم پێ رانەدەگیراو پێم خۆش بوو سەبارەت بەو شتانە لەگەڵ کەسێك بدوێم.

لەبارەی ئەو هەموو زۆر بلێیەوە داوای لێبوردنت لێدەکەم. دیارە ئەم زۆر بلێیەش هێدی هێدی کەمتر دەبێتەوە. داوات لێ دەکەم ئەگەر نامەکانم دەبنە هۆی وەڕەزیت، لە سەتلی خەوشوخاڵیان هاوێ. بەڵێنی دەدەم تا ناوەڕاستی مانگی "نوامبر" هیچت بۆ نەنووسم.

کچی زۆر بلێت

جوودی ئابوت

## ١٥ی نوامبر

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

گوێ راگرە بۆ ئەوە ئەمڕۆ فێری بووم:

- رووبەری سێلیی "هەرەمی" ناتەواو لە هەرەمی رێکوپێک، بەرامبەرە لەگەڵ نیوەی ئەنجامی لێکدانی سەرجەمی دوو بنکەی ئەو، کە لێک دەدرێ لەگەڵ بەرزایی هەر یەك لە دوو "زووزەنەقە"کانی.[1]

ئەگەر ئەم مەسەلەیەت پێ درووست نیە دەتوانم بیسەلمێنم.

من تا ئێستا لەبارەی ئەو جلوبەرگانەوە کە لەبەریان دەکەم، هیچم بۆ نەنووسیوی وا نیە؟ ... شەش قات جلی تازەم کڕیون کە هەموویان نوێو خاوێنن واتە لەو سڕو سیپاڵانە[2] نین کە لە پێشدا لەبەر کەسێکی لە خۆم قەبەتردا بووبێ، بەڵکوو تازەنو لەبەر نەکراون.

تۆ نازانی ئەو شتە لە ژیانی هەتیوێکی بێدەرەتانی وەك مندا چەندە گرینگە. دیارە تۆ ئەو جلوبەرگە جوانو دابی رۆژەت بە من بەخشیوە هەر بۆیەش

---

[1] دەقی فارسییەکەی بەم شێوەیە:

سطح محدب هرم ناقص از هرم منظم برابر است با نصف حاصل ضرب مجموعه محیط قاعدتین در ارتفاع هر یك از دو ذوزنقەهای آن

[2] سڕو سیپاڵ بە جلوبەرگی کۆنو زۆر لەبەرکراو دەڵێن.

زۆرت سپاس دەکەم. هەلو دەرفەتی دەرس خوێندن نەرد[3]ێکی گەورەیە بەلام بوونە خاوەنی جلوبەرگی نوێ شتێکی بێوێنەیە کە لە تاریف نایە.

جێگای شوکرە کە خاتوو "بریچارد"ی ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری، ئەو جلانەی بۆ هەلبژاردووم، نەک خاتوو "لیپیت" ... یەک لەوانە جلی شەوە. قوماشەکەی لە تۆڕی پەمەیی‌یە، لەگەڵ کراسێکی ئاورێشم کە هەرکات لەبەری دەکەم بەڕاستی جوانو لەبەردلان دەبم. قاتێک بۆ کلیسایەو رەنگی شینە. قاتێکیان تایبەتی عەسرانو کاتی چای خواردنەوەیە، لە قوماشی سوورە کە رووەکەی بە شێوەی خەلکی رۆژهەلات بەدەست چنراوە، کە لە بەری دەکەم راست وەك کاولیەکان دەچم. هەروەها قاتێکی دیکەیان لە ئاوریشمە بە رەنگی چێرەیی مەیلەو زەرد لەگەڵ کۆتو داوێنێکی خۆلەمێشی کە بۆ پیاسەو کاتی شت کڕین دەبێ. سەرنجام دوایەمین قات جلوبەگی ساکارە بۆ کاتی دەرس خوێندنم کڕیوە.




[3]. نەرد، شانس

## وێنەی جوودی کاتی باسێکتباڵ

دیارە ئەو جلوبەرگانە بۆ "جولیا پندلتون" زۆر سووکو بێ بایەخن بەڵام "جیرۆشا"... زۆریسی لەسەر زیادە.

رەنگە بفەرمووی خابن بۆ ئەو پارەیە کە لە کچێکی وەك مندا سەرف دەکرێو پێت وابێ کە من کچێکی هیچو پووچم. بەڵام بابە! ئەگەر تۆش بە درێژایی تەمەن جلوبەرگی تایبەتی قوتابخانەت لەبەر کردبا، ئەوکات دەتزانی ئێستا من لە چ حاڵێکدام.

راست ئەو کاتەی پێم نایە قوتابخانەی ناوەندی، سەربەرگە (رووپووش)ەکەم وەزعێکی خراپتری بەخۆیەوە گرت چونکە ئەوکات رووپووشگەلێکم لەبەر دەکرد کە خەڵکی خێرۆمەند بۆ قوتابخانەیان دەنارد.

باوەڕ ناکەی کە بە چ کەشتەنگی[1] یەکەوە دەچوومە قوتابخانە. هەموو کات وامدەزانی لای کچێکەوە دامدەنێن کە جلەکانم لە پێشدا هی ئەو بووەو ئەویش بە سرتە هەڤاڵەکانی تێ ئەگەیەنێو هەموویان پێم پێ دەکەنن. خوا دەیزانێ ئەگەر تا دوایین رۆژەکانی تەمەنم هەر گۆرەویی ئاوریشم لەپێ بکەم هێشتا برینی سەر دڵم سارێژ نابێ.

"ج . ئابووت"

---

[1] کەشتەنگی: نارەحەتیو خەمباری

- پەراوێز

دەزانم نابێ چاوەڕوانی وەڵامی نامەکە لە لایەن تـۆوە بم. هـەروەها ئەوەشـیان پێ گوتووم کە نابێ بە هێنانە پێشی پرسیاری بێجێ ببمە هۆی وەڕەزیت. بـەڵام بابە! تەنیا یەك جارو یەك پرسیار.

دەمویست بزانم تۆ زۆر بەساڵاچووی یـان کـەمێك پـیری؟ سـەرت بـە تـەواوی بێتووکە یان هەندێك لە قژەکانت وەریون؟ نازانم سیمات چـۆن بێنمـە بەرچـاوم؟ ... زاتێکی بەرێز کە خۆشی لە کچان نایە، بەڵام لـە بەرامبـەردا زۆر سـاماندارو لێبوردەیە بەتایبەت دەرهەق بە کچێکی زۆربلێ، کـە دەیـەوێ خـۆی لـە هـەموو کارێکدا هەڵقورتێنێ. من نازانم پیاوێکی ئاوا دەبێ چ قەڵافەتێکی هەبێ.

**١٩ی دیسامبر**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

تۆ هەرگیز پرسیارەکانی من وەڵام نادەیتەوە، لە حاڵێکدا ئەوە بۆ من زۆر گرینگە.



ئایا سەرت بە تەواوی بێتووکە؟

من وێنەی تۆم بەو چەشنەی کە بە بیرمدا دێ کێشاوە، بەڵام کە دەمهەوێ وێنەی سەرت بکێشم تێدا دەمێنمەوە. نازانم سەرت چەرمووە، رەشە، ماشوبرنجی‌یە یان سەرت بە تەواوی بێتووکە. فەرموو ئەمە وێنەی تۆیە ئێستا

گرفتەکە لێرەدایە کە دەبێ تووکی سەرت بۆ دانێم یان داینەنێم؟

دەتەوێ بزانی چاوەکانتم چۆن کێشاوە؟ بە رەنگی شینی کاڵو مووی برۆکانت راست وەستاون. دەمیشت هێڵێکی راستە کە لە هەردوو لاوە هەندێك بەرەوخوار داکشاون.

ئەوەش دەزانم چون ئینسانێکی. تۆ پیرەپیاوێکی بە ورەو خوێنگەرمو مەشرەفخۆشی.

(زەنگی کلیسایان لێ دا)

کاتژمێر ٩:٤٥ دەقیقەی پاش نیوەڕۆ

من لەگەڵ خۆم پەیمانێکم بەستووە کە قەت نایشکێنم. پەیمانەکەشم ئەوەیە کە هیچ کات ئەرکەکانی دەرس خوێندنم بە شەو ئەنجام نەدەم. لەباتیی ئەوە کتێبە ئاسایی‌یەکان دەخوێنمەوە. زۆرم نیاز بەو شتەیە. چونکە من ١٨ ساڵی تەمەنم هەروا بە فیڕۆ داوەو دەبێ قەرەبووی ئەو ساڵانە بکەمەوە. ئێستا دەزانم کە تووشی چ هەڵەیەکی گەورە بووم.

تا ئێستا لە هەموو ئەو ئەرکانەی کە کچێکی خاون دایكو باب هەستی پێ دەکاو دەبێ ئەنجامیان بداو فێریان بێ، غافڵ بووم.

من هیچ کات "دیوید کاپرفیلد"[1] یان "ئیوانهو"[2] یان "پەلەوەری ئاوی"[3] یان "رابینسون کروزە" یان "جین ئایر"[4] یان "ئالین لەسەر زەوی

---

[1] یەکێکە لە کتێبە بەناوبانگەکانی چارلز دیکنز

[2] ئیوانهو رۆمانی مێژوویی والتر ئیسکات، نووسەری ئینگلیسی

[3] پەلەوەری شاوی، نمایشنامەیەکی بەناوبانگ کە موریس پیتر لینگ نووسیویە

عەجایب" یان یەك وشەم لە "رودیارد کیپلینگ"[1] نەخوێندۆتەوە. من نەمدەزامی هانریی شەشەم زیاتر لە یەك ژنی هێناوە یان ئەوە کە "شیلی" شاعیر بووە. من نەمدەزانی مرۆڤ لە پێشدا چۆن بووە یان بەهەشت چۆن جێگایەکە. نەمدەزانی RLS کورتکراوەی "رابێرت لوتی ستیوسین"[2]ـە. یان "جۆرج ئیلیوت" ژن بووە. هیچ کات وێنەی "مونالیزا"[3]م نەدیبوو. (بڕوام پێ بکەی یان نەکەی) هیچکات ناوی "شیرلوك هیلمز"م نەبیستبوو.

بەڵام ئێستا هەموو ئەوانەم خوێندۆتەوەو زۆر شتی زیاتر لەوانەش دەزانم. لەگەڵ ئەوەش دەبێ زۆر هەوڵێم تا بە هاوڕێکانم بگەمەوە.

هەروەها زۆرم پێ خۆشە کە تەواوی رۆژ بەو هیوایە شەو دابێ و لەسەر گەلایەك کاغەز ئەم رستەیە بنووسم کە: "تکایە دەمەوێ تەنیا بم"و بیدەم بە دەرگای ژوورەکەمدا. ئەمجارە جلە سوورە نوێیەکانم کە تایبەتی کاتی نووستنە، لەبەر کەم، پێڵاوە دەمپێییە خەزدارەکانم لەپێ کەم. هەموو باڵنجەکان لەپشت سەرمەوە لەسەر قەرەوێڵەکە وەك پاڵپشت دانێم، چرای پایە برنجیی تەنیشت قەرەوێڵەی لێ هەڵکەم و دەست بکەم بە خوێندنەوەی کتێب. ئەوەندە بخوێنمەوە تا هەست و هیلاك دەبم. ئای کە خۆشە.

تەنانەت تاقە کتێبێکیش بەس نیە. من بە جارێك چوار کتێب دەخوێنمەوە.

---

[4] "جێن ئایر" رۆمانێکە لە نووسینی شارلوت برونتە خانمە نووسەری ئینگلیسی

[1] "رودیارد کیپلینگ" رۆمان نووس و شاعیری ئینگلیسی ١٨٩٤ ـ ١٨٥٠

[2] "رابێرت لوتی ستیوسین"، نووسەری گەورەی ئینگلیسی ١٨٩٤ ـ ١٨٥٠

[3] مەبەست تابلۆی بەناوبانگی ژوکوند شاکاری لیئۆنارد داوینچی نیگارکێشی گەورەی دەورانی رینسانسە.

ئەو کتێبانەی کە ئێستا خەریکی خوێندنەوەیانم، ئەمانەن.

- شیعرەکانی "تینسون"[1]
- "ڤی نی تی"ی باش[2]
- چیرۆکە شاکارەکانی "کیپلینگ"[3]
- دوایەمینیشیان ئەگەر پێم پێ نەکەنی "ژنانی بچکۆلە"[4]

زەنگی کاتژمێر ١٠ لێدرا.

شەمە

ئەوپەڕی شانازیە ئەگەر ڕێگام بدەی ئەو شتانەی کە لە بواری ئەندازیاریدا فێریان بووم، پێتانی رابگەیەنم.

هەینی رابووردوو خوێندنەوەمان لەبارەی "متوازی السطوح" کۆتایی پێ هێناو بە متالآی مەنشوری ناتەواوەوە خەریك بووین. دیارە توێژینەوەو خوێندنەوە لەو بوارەدا گران دێتە بەرچاو. ٨

یەکشەمە

حەوتووی دادێ پشووی جێژنی "کریسمەس" دەست پێ دەکا. کچەکان هەر لە ئێستاوە جانتاکانیان پێچاوەتەوەو لە دالآندا دایانناون بە چەشنێك کە بە گران دەکرێ بە دالآندا هاتووچۆ بکرێ. دەنگی هەراو پێکەنین لە هەموو

---

[1] Tennyson
[2] Vanity fair
[3] Kipling,s Plainteles
[4] Little Women

ژوورەکانەوە دەبیسترێ. هەموو دەستیان لە خوێندن و خوێندنەوە هەڵگرتووە. بێجگە لە من و کچێکی دیکە کە لێرە دەمێنێتەوە. ئێمە بڕیارمان داوە بەرنامەیەکی رێپێوان و پیاسە بۆ خۆمان دابنێین و ئەگەر سەهۆڵیش هەبێ خلیسکێن فێر بین. هەروەها چەند کتێبێکیش لە بەرنامەمان دان کە بیانخوێنینەوە. هیوادارم تۆش وەك من هەست بە شادمانی بکەی.

خوات لەگەڵ بابە

بچووکی هەتا هەتاییت

جوودی

پاشکۆی نامە

بابە گیان! راستی لەبیرتان بێ وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە. ئەگەر خۆت پێت خۆش نەبور تکایە بە سکرتێرەکەت بفەرموو وەڵامم بداتەوە. دیارە دەشتوانی بە تێلێگرام پێم رابگەیەنی کە:

سەری جەنابی "ئیسمیت" بێتووکە؟

یان سەری جەنابی "ئیسمیت" بێتووك نیە؟

یان جەنابی "ئیسمیت" سەری سپی کردووە؟

دەتوانی ٢٥ سێنت لە پارەی مانگانەکەم بابەتی حەقی تێلگرام کەم بکەیتەوە.

تا ژانوویە بەدۆعا

جێژنت پیرۆز بێ

## ئاخرو ئۆخری پشووی کریسمەس
## رێکەوت بە باشی نازانم

بابە لاق درێژی خۆشەویست

تۆ لە کوێی؟ خۆزیا لێرە بای. ئەو دنیایەی کە من لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە دەیبینم، بە بەفری سپی داپۆشراوە. کولوە بەفرەکان بە گەورەیی گوڵە خاشخاش بە حەواوە هەڵوەدان. رۆژ لە ئاوا بووندایەو تیشکی رۆژ لە پشت چیا کەوەسپیرەکانەو بە رەنگی زەردی رووناكو ئیکلیلی[1] دێنە بەرچاو.

لە پەنا پەنجەرەدا دانیشتووم‌و لە حاڵێکدا دوایەمین تیشکی هەتاو شادیم پێ دەبەخشێ، ئەم نامەت بۆ دەنووسم.

ئەو پێنج سکە زێرەی کە بۆت ناردبووم، دیاری یەکی چاوەڕوان نەکراو بوو. تا ئێستا رێنەکەوتووە کەسێك جێژنانەم بداتێ، تۆ زۆر شتت پێ داوم کە لە رابووردوومدا وێنەیانم نەدیوە. یانی ئێستا من هەرچم هەیە لە تۆوە پێم گەیشتووەو هی تۆیە.

وا هەست دەکەم کە شیاوی ئەو هەموو لوتفە نیم. لەگەڵ ئەوەش لە وەرگرتنی سکە زێرەکان نوقمی شادی بووم. دەتەوێ بزانی چم لە پارەکەی

---

[1] ئیکلیل: تۆزێکی بریقەدارە بە رەنگی سوور، زەردو سپی‌و ... کە لە کاری نگارکێشیدا کەڵکی لێ وەردەگرن

کردووه؟ ئەم کەلوپەلانەی خوارەوەم پێ کڕیون:

١ـ کاتژمێرێکی زێو، تا لە کاتی خۆیدا لەسەر کەلاس ئامادە بم.

٢ـ کتێبی هونراوەکانی "ماتیو ئارنولد"

٣ـ کیسە ئاوگەرمێك

٤ـ دۆشەکێکی کارەبا (چونکە ژوورەکەم زۆر ساردە)

٥ـ پێنسەد گەڵا کاغەزی کایی (ئەگەر بڕیارە ببمە نووسەر دەبێ هەر لە ئێستاوە دەستبەکار بم)

٦ـ کتێبێکی فەرهەنگ

٧ـ (شەرم دەکەم دوایەمینەکەیانت بۆ بنووسم بەڵام چار نیە): جووتێك گۆرەویی ئاوریشم

ئەگەر دەتەوێ بزانی مەبەستم لە کڕینی گۆرەویی ئاوریشم چی بووە، دەبێ بڵێم:

شەوان کە "جولیا پندلتون" دەهاتە ژوورەکەی من کە پێکەوە دەرسی ئەندازیاری حازر بکەین، ئەو لەسەر مۆبل دادەنیشتو لاقی لەسەر لاق دادەناو هەموو کات گۆرەویی ئاوریشمی لەپێدا بوو.

سەبر کە با "جولیا" لە پشووی جێژنی کریسمەس بێتەوە، ئەنجار منیش گۆرەویی ئاوریشم لەپێ دەکەمو دەچمە ژوورەکەی. بابە دەزانی بوونەوەرێکی چەند بێچارەم؟ بەڵام هەرچۆنێك بێ ئینسانێکی دڵپاکێ ساکارم. دیارە تۆ لە رابووردووی من لە هەتیوخانە ئاگاداری. بەڵێ ... راستە بێکەموکووڕیش نیم. وانیە؟

لەکورتی بیبڕمەوە: (ئەمە وشەیەکە کە مامۆستای زمانی ئینگلیسیەکەمان لەکاتی دەرس گوتنەوەدا زۆری دووپات دەکاتەوە) بۆ ئەو حەوت دیاریەت زۆر

منەتبارم. من بە کچەکانم گوتووە کە ئەو دیارییانەم لە لایەن کەسوکارمەوە لە "کالیفۆرنیا"وە بۆ هاتووە:

- کاتژمێرەکە لە لایەن بابەگەورەمەوە.
- دۆشەکی کارەبا پوورم ناردوویە.
- کیسەی ئاوی گەرم دیاری دایەگەورەمە (کە دایم نیگەرانی وەزعی منە) نەوەك لەم هەوا ساردەدا نەخۆش کەوم.
- کاغەزی کایی لە لایەن "هینری" برا بچووکەکەمەوە بۆم رەوانە کراوە.
- گۆرەویی ئاوریشم هی "ئیزابیل"ی خوشکمە.
- شیعرەکانی "ماتیو ئارنوڵد" دیاری میمکە "سوزان"ـە.
- کتێبە فەرهەنگەکەش مامە "هنری" بۆی ناردووم.

هیوادارم لەوەی کە دەبێ لە نەخشی بنەماڵەی جەنجاڵو شلوقی مندا یاری بکەی لێم زیز نەبی.

بەڵێ ... ئێستا دەمەوێ لەبارەی پشووی جێژنەوە چەند دێڕێکت بۆ بنووسم هەرچەند لەوانەشە تۆ هەر لەبیری دەرس خوێندنی مندا بی، نەك حەسانەوەو پشوودانم.

ئەو کچەی کە لە نامەی پێشوودا ئیشارەم پێ کرد، خەڵکی "تێگزاس"ـەو ناوی "لێئونورا فێنتۆن"[1] ـەو دوو کچی دیکە کە لە کەلاسێکی سەرووتردان. هەموو رۆژێك ئەگەر کەشو هەوا خۆش بوایە، تەنوورەی کورتو جاکەتی چنراومان لەبەر دەکرد، هەر یەکە داردەستێکمان بە دەستەوە دەگرتو هەموو دەوروبەری ئێرە دەگەڕاین. جارێکیان زیاتر لە چوار "میل" بەڕێدا رۆشتین، تا

---

[1] Leonora Fenton

گەیشتینە شار. ئەمە شارۆچکەیەکە کە کچانی زانکۆ نانی لێ دەخۆن. لەوێ ژەمی نیوەڕۆمان خوارد. خواردەمەنییەك کە لە گۆشت ساز کرابوو، بە ٣٥ سێنت. دێسێرتێكو پلێتێك کێکی شکولاتی بە ١٥ سێنت کە هەم هەرزان بوونو هەم پڕ بوون لە کالوری.

بۆ من کە لە هەتیوخانە گەورە بوومو بێجگە لەوێ شوێنێکی دیکەم نەدیوە، ئەم گەڕانو رابواردنانەم زۆر پێ خۆش بوو. هەر کات لە زانکۆ وەدەر دەکەوم هەست دەکەم لە قەفەس هاتوومەتە دەرێ.

جارێکیان بێ ئەوەی ئاگام لە خۆ بێ هەستی خۆم بۆ ئەوانی دیکە باس کرد، بەڵام زوو بە خۆمدا هاتمەوەو قسەکانم گۆڕی. زۆر دژوارە کە ئینسان هەموو کات ئاگاداری خۆی بێو پێش بە هەستەکانی بگرێ.

هەمیشە پێم خۆشەو لەگەڵ کەسانی دیکە دەردەدڵ بکەم. ئەگەر تۆم نەبایە کە پرێسکە[1]ی خەمەکانت لەلا دەکەمەوە، دیقم دەکرد.

هەینی رابووردوو لە کۆشکی "فرکوسن"[2]دا جێژنی شیرینی سازکردنمان هەبوو. لەسەر یەك ٢٢ کەس لە خوێندکارانی ساڵەکانی یەکەم، دوویەم، سێیەمو چوارەم بووین. ئەو بینایە چێشتخانەیەکی گەورەی هەیەو دەفری مسینی وەك کتری، تاوە، مەنجەڵو زۆر شتی دیکە بە دەوراندەوری دیوارە بەردینەکەیدا هەڵواسرابوون. چوارسەد کچ لەو بینایەدا دەژین. بەرپرسی چێشتخانەکە کڵاوێكو بەروانکەیەکی سپیی لەبەردا بوو، ٢٢ بەروانکەی سپیو کڵاوی هێناو لەبەرمان کردن. راست چووینە سەر شێوەی چێشکەرەکان. دیارە هەرچەند

---

[1] پریسکە: بوخچەی بچکۆلە

[2] Fergussen

شیرینییەکان باش لەئاو دەرنەهاتن بەڵام زۆر خۆشمان لێ رابرد.



وێنەی کچەکان کاتی چێشت ساز کردن

پێت وا نیە لەباتی ئەوە ببمە نووسەر، باشتر وایە ببمە نیگارکێش؟

کاتێـك کـاری شـیرینی سـازکردن تـەواو بـوو، دەسـتو دەموچـاوو تەنانـەت دەسـتگیرەی درگـاو زۆر شـوێنی دیکـە لـە شـیلەو پلـەکابوون[1]. ئـەجارە هەریەکەمان کەوچكو چـنگاڵو تیانەیـەکمان هـەلگرتو هـەروا کـە جلوبـەرگی چێشتخانەمان لەبەردا بوو، لـە حالێـکدا سـروودی زانکۆمـان دەخوێنـدەوە، بـە دالانـی زانکـۆدا کەوتینـە رێ. گەیشـتینە ژووری کێشـکی مامۆسـتاکانو شـیرینیمان بـۆ بـردن. دەزانـی بابـە لـە زەمینـەی راهـاتنو فێربوونـدا چـۆن پێشکەوتووم. دوو رۆژی دیکە پشووی جێـژن تـەواو دەبـێو لـەوەی کـە کچـەکان دەبینمەوە خۆشحاڵم.

ئەو بینایەی کە منی تێدام زۆر ئارامو بێدەنگە. بینایەك کە بۆ چوارسەد کچ

---

[1] پلەکان: پێوەنووسان، تێوەچوون

دروست کراوە، ئێستا ٩ کەسی تێدا بژی دیارە دەبێ چۆن بێ.

تا ئێستا ١١ لاپەڕەم ڕەش کردۆتەوە. ئۆی بابەی بەستەزمان. بێگومان لە خوێندنەوەیان ماندوو بووی. کاتێك دەستم بە نووسین کرد، دەمویست زۆر بە کورتی تەنیا سپاسێکت لێ بکەم. بەڵام کە دەست بە نووسین دەکەم نازانم بۆچی ئەوەندە درێژەی پێ دەدەم. خوات لەگەڵ لەوەی کە لەبیری من دای، سوپاست لێ ئەکەم.من دەبیا زۆر خۆشحاڵ بام، بەڵام پەڵە هەورێکی بچووك ئاسمانی خۆشیەکانمی داپۆشیوە، ئەویش تاقیکردنەوەی مانگی فێوریەیە.

پەراوێزی نامە:

ڕەنگە ئەوە باش نەبێ کە زۆر جار بۆت دەنووسم "ئەو کەسەی کە تۆی خۆش ئەوێ" ئەگەر کارەکەم هەڵەیە داوای لێبووردنت لێ دەکەم، بەڵام هەرچۆنێك بێ دەبێ کەسێکم خۆش بوێ. دەبێ لە نێوان تۆو خاتوو "لیپیت"دا یەکێکتان هەڵبژێرم. کەوابوو بابەگیان تۆ بە گەورەیی خۆت ئەو بارە گرانەم لێ قبووڵ کە ئاخر چۆن دەتوانم خاتوو "لیپیت"م خۆش بوێ؟

## پێش تاقیکردنەوە

**بابە لاق درێژی خۆشەویست**

باوەڕ ناکەی کە هەموو کچەکان بە پەلەو جۆش‌و خرۆش خەریکی ئامادەکردنی دەرسەکانن؟ هەموو پشووی جێژنیان لەبیر چۆتەوە وەك ئەوە لە جیدا پشوویەك لە کاردا نەبووبێ. من لە ماوەی ئەم چواردە رۆژەدا پەنجاوچوار کرداری بێقاعیدەم لە مێشکی خۆمدا جێ کردۆتەوە. هیوادارم تا دەست پێکردنی تاقی کردنەوە هەر لەوێدا رایانگرم؟ هەندێ لە کچەکان دوای تاقیکردنەوە کتێبەکانیان دەفرۆشن، بەلام من دەمهەوێ کتێبەکانم بهێلمەوەو پاش تەواوکردنی دەرس لە پەنای یەکدا ریزیان بکەم‌و لە قەفەسەدا دایان نێم، بۆ ئەوەی نموونەی خوێندەواریم لای خۆم راگرتبێ‌و لەکاتی پێویستدا پێیاندا بچمەوە. وا دەزانم باشتر لەوەیە کە ئینسان مەجبوور بێ ئەو هەموو زانیاری‌یە لە مێشکی خۆی‌دا راگرێ.

"جولیا پندلتون" بۆ چەند لەحزەیەك هاتە ژوورەکەم بەلام یەك کاتژمێر مایەوەو لە بنەماڵەی خۆی دوا. من زۆرم هەوڵ دا قسەکانی پێ بگۆڕم بەلام نەکرا.

"جولیا" لێی پرسیم ناوی دایکم لەکاتی کچێتی‌دا چی بووە. تۆ بفەرموو ئەمەش بوو بە پرسیار؟ کەسێك لە هەتیوخانەدا گەورە بووبێ ئەگەر پرسیارێکی وای لێبکەن چ حاڵێك پەیدا دەکا؟ تەنانەت توانای ئەوەم نەبوو بڵێم: نازانم ... هەر بۆیەش یەکەمین وشەیەك بە مێشکمدا هات ئەوە بوو گوتم ناوی "مونت

گومیری" بوو. پاشان کارەکەم لێ قوولّ بووەوە. "جولیا" دەیویست بزانێ لە "مونت گومیری"یەکانی "ماساچوسێت"ین یان لە "مونت گومیری"یەکانی "ویرجینیا".

دایکی "جولیا" لە "روتر فورد"ەکانە کە لەگەڵ "هانریی هەشتەم"دا خزمایەتی‌یان هەیە. بەرەبابییشی دەچنەوە سەر باوە ئادەم.

بەکورتی ئەگەر بە رابووردووی بنەماڵەی "جولیا"دا بچیتە خوارێ، دەبینی لە بنەچەی مەیموونە باڵانشینەکانی سەرەوەن کە مووی لەشیان وەك ئاورێشم نەرمو ملیان زۆر درێژە.

بابە! لە پێشدا دەمویست نامەیەکی پڕ لە شادیو خۆشیت بۆ بنووسم، بەڵام زۆرم خەودێ. ماندوومو دڵەراوکێشم هەیە. تەنیا من وا نیم بەڵکوو هەموو قوتابییەکانیان ساڵی یەکەم لەو حاڵەدان.

ئەو کچە بچووکەت کە لە رێگای تاقیکردنەوە دایە

جوودی ئابووت

## یەکشەممە

## بابەلاق درێژی خۆشەویست

هەواڵێکی زۆر ناخۆشم پێیە. بەڵام نامهەوێ نامەکەن بەو هەواڵە خراپە دەست پێ بکەم. وا چاترە بە چەند قسەی دیکە ببمە هۆی شادیتو پاشان ئەو هەواڵە ناخۆشەت بۆ بنووسم.

" جیرۆشائابۆت" کاری نووسەریی بە هۆنینەوەی شیعرێك لەژێر سەردێڕی "لەکەلووی منەوە"[1] دەست پێ کردووە. شێعرەکە لە لاپەڕەی یەکەمی گۆڤاری مانگانەی زانکۆدا چاپ کراوە. ئەو شتە بۆ خوێندکارێکی ساڵی یەکەم شانازییەکی گەورەیە.. دوێنێ شەو کە لە کلیسا دەهاتینە دەرەوە مامۆستای زمانی ئینگلیسی بانگی کردمو گوتی شێعرەکەم زۆر بەرز بووە. ئێستا من نوسخەیەکت بۆ دەنێرم ئەگەر پێت خۆش بوو بیخوێنەوە.

با بزانم مەتڵەبێکی خۆشی دیکەم هەیە بۆتی بنووسم ... ئاها ...

١ـ من خلیسکێنی سەر سەهۆڵ فێر بووم. ئێستا دەتوانم زۆر بە رێکوپێکی لەسەر سەهۆڵ خلیسکێن بکەم.

٢ـ فێر بووم لە میچی ژووری "ژیمناستیك"ـەوە بە تەناف بێمە خوارەوە.

---

[1] نووسەر دەڵێ "لە بورجی منەوە". بورج ئەگەر مەبەست بورجی فەلەکی بێ بەکوردی کەلووی پێ دەگوترێ. بورج لە فارسیدا مانای قەڵاو کۆشکیش دەدا نازانم نووسەر مەبەستی کامەیە.

٣ـ فێر بووم بەسەر کۆسپی ١:٢٥ سانتی‌دا باز بدەم‌و هیوادارم بەم زوانە بازدان بەسەر کۆسپدا بگەیەنم بە دوو میتر.

بەیانی ئەمڕۆ قەشەی "ئالاباما" لە ئامۆژگارییەکانیدا دەیگوت:

ئەوەی بەخۆتی ڕەوا نابینی، بە کەسی دیکەی ڕەوا مەبینە.

دەیویست بڵێ مرۆڤ دەبێ لەباوەی کەموکورتییەکانی کەسانی دیکەوە لێبووردە بێ‌و لەخۆڕا ئابڕوی خەڵك نەبرێ. جێگای تۆ سەوز بوو. ئەمڕۆ خۆرەتاوترین ڕۆژی زستانە. چلورەکان تك تك ئاویان لێ دەتکێ‌و بەسەر دارە کاژەکاندا دێنە خوارێ. دنیا لەژێر نهێمی بەفردا چەماوەتەوە من لەژێر خەمێکی گەورەدا.

ئێستا کاتی درکاندنی هەواڵە ناخۆشەکەیە. "جوودی" مەترسە ئازابە. هەرچۆنێك بێ دەبێ بیلێی. بەڵام دەبێ خاترجەم بم کە ورەتان باشەو لەسەر کەیفی؟ بەڵێ ... من لە دەرسی ماتماتیك‌و پەخشاندا سەرکەوتوو نەبووم. ئێستا خەریکم دەوریان دەکەمەوە کە لە مانگی داهاتوودا دیسانەوە لە تاقیکاری‌دا بەشدار بم. زۆر بە داخەوەم ئەگەر ئەو هەواڵە ببێتە هۆی دڵتەنگرانیت. بەڵام خۆم زۆرم بەلاوە گرینگ نیە، چونکی پێم وایە لەم ماوەیەدا زۆر شتی دیکە فێربووم کە لە بەرنامەی دەرسدا نەبووە.

من حەڤدە کتێب‌و بڕێکی زۆر شێعرم خوێندۆتەوە. کتێبگەلێکی بە بایەخی وەك "ونی تیی باش"ی "ریچارد فوریل"، "ئالیس لەسەر زەویی عەجایب"، "وتارەکانی ئیمرسون"[1]، "ژیانی ئیسکات"[2] لە نووسینی "لارك هارت"، بەرگی یەکەمی "ئیمپراتۆری ڕۆم" لە نووسراوەکانی "گیبون"و نیوەی کتێبی

---

[1] Emerson
[2] Lifeof Scott

ژیاننامەی "بنیونوتوسیلینی"[3]. زۆر کتێبی چاکن، وانیە؟

دیارە ئەگەر تەنیا بە دەرسی لاتینەوە خۆم خەریك بکردایە، زۆرم کەمتر لە ئێستا دەزانی. ئەگەر بەڵێنیت بدەمێ کە ئیدی ڕەت نابمەوە، لێم دەبووری؟

شەرمەساری تۆ

جوودی

[3] Benvenutocellini

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

ئەمە نامەیەکی نائاساییە کە لە ناوەڕاستی ئووتدا بۆت دەنووسم. چونکە ئەمشەو زۆر هەست بە تەنیایی دەکەم. گژەبایەکی ترسناک هەڵی کردووە، بە توندیش شڵێوە دەکات‌و دڵۆپە باران بەقەو لە شووشەکان دەدرێن. چراکانی دەرەوە هەموو کوژاونەوە. من قاوەم خواردۆتەوە خەوم نایە. ئەمشەو "سالی"و "جولیا"و "لیئونورا" میوانم بوون. خواردنی شێومان بریتی بوو لە: ساردین، نانی برژاو، زەڵاتەو قاوە. "جولیا گوتی:

- زۆر خۆشمان لێ رابورد.

"سالی" لە لای من مایەوە کە لە شۆردنی قاپوقاچاخەکاندا یارمەتیم بدا. ئەمشەو چەند کاتژمێرێك دەرسی لاتینم دەور کردەوە. ئەوە مسۆگەرە کە لە دەرسی لاتیندا خوێندکارێکی باش نیم.

لەکورتی بیبڕیبنەوە، داخۆ پێت دەکرێ لە رۆڵی دایە گەورەی من دا یاری بکەی؟ "سالی" دایەگەورەی هەیە، "جولیا"و "لیئونورا"ش هەرکام دایە گەورەیەکیان هەیە. ئەمشەو ئەوانیان لەگەڵ یەك بەراورد دەکرد.

دوێنێ چوومە بازاڕ کڵاوێکی تۆڕی جوانم دی کە بە تێلمێکی گوڵدار رازاندبوویانەوە. بابەتی دایەگەورە بوو (لەسەر ئیزنت) دەمەوێ بە بۆنەی هەشتاو سێیەمین ساڵی لەدایکبوونتەوە پێشکەشی تۆی بکەم.

ئەمە دەنگی زەنگی کلیسا بوو کە کاتژمێر ١٢ی راگەیاند. وادیارە خەوم دێ دایەگەورە گیان. شەو باش.

ئەو کەسەی کە لە قووڵایی دڵەوە خۆشی دەوێ

"جوودی"

**یەکی مانگی مارس**

**ب . ل . د ـ خۆشەویست**

خەریکم پەخشانو رێزمانی لاتین دەخوێنمەوە: من خوێندبوومەوە. من دەیخوێنمەوە. من دەمەوێ بیخوێنمەوە ... تاقیکردنەوە رۆژی شەممە زەنگی حەوتەم دەست پێ دەکا. یان دەبێ سەرکەوم یان شەق بەرم. کەوابوو دوای تاقیکردنەوە یان نامەیەکت لە جودیی لەشساغەوە پێدەگا یان هەواڵی لەتوکوتەکانی "جوودی"ی داماو هەرچۆنێك بێ هەرکات تاقیکردنەوە تەواو بوو نامەیەکت بەوپەڕی رێزەوە بۆ دەنووسم. بەڵام ئەمشەو کارم زۆرە.

ئەو کەسەی زۆری پەلەیە

ج ـ ئـ

**٢٦ی مارس**

**جەنابی ب . ل . د ئیسمیت**

**گەورەی بەڕێز**

تۆ قەت وەڵامی نامەکانی من نادەیتەوەو بە دەربەستی کارەکانی منەوە نیت. پێم وایە تۆ دڵڕەق ترین بوونەوەری خێرخوازی. هۆی ئەوە کە خەرجی دەرس خوێندنی منت لە ئەستۆ گرتووە لەبەر خۆشەویستی من نیە، بەڵکوو بۆ ئەوەیە ئەرکێکت ئەنجام دابێ. من هیچ شتێك لە بارەی تۆوە نازانم، تەنانەت نازانم ناوت چیە. ئاخر چۆن دەبێ ئینسان نامە بۆ "شتێك"!! بنووسێ؟ پێم وایەو دڵنیاشم بێ ئەوە لە نامەکانم بڕوانی یەکسەر لە سەتڵی خەوشوخاڵیان دەهاوی. لەمڕۆوە تەنها لەبارەی دەرسەکانمەوە نامەت بۆ دەنووسم‌و بەس. لە تاقیکردنەوەی لاتین‌و ئەندازیاریدا بەشدار بوومەوەو لە هەردوویاندا سەرکەوتم.

لەگەڵ ڕێزو سپاس

جیرۆشا ئابۆت

**٢ی ئاوریل**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

من دەعبایەکی سەیرم. سەبارەت بەو نامە گەوجانەیەی کە حەوتووی رابووردوو بۆم نووسیبووی، داوای لێبووردنت لێ دەکەمو هیوادارم لەبیری خۆتی بەریەوە. شەوێك کە ئەو نامەیەم نووسی بەڕاستی تەنیا بووم. دڵم تەنگ بوو. ملم دێشا. نەمدەزانی سەد جۆرە نەخۆشینم هەیە. ئێشی گەروو، ئاوسانی زمانە بچکۆلە، هەڵامەتو چەند نەخۆشییەکی دیکە کە ناویان نازانم. شەش رۆژە لە بەشی نەخۆشخانەدا کەوتوومو ئەمە بۆ یەکەم جارە قەڵەمو کاغەزیان داومێو رێگایان داوم دابنیشم. پەرستارەکانی ئێرە برێك رووگرژن. هەموو ئەو ماوەیەی کە لێرەم، بیرم هەر بەلای نامە گۆڕینەوە بوو. دەزانم تا تۆ لێم خۆش نەبی چاك نابمەوە. وێنەی خۆم بەسەرو ملی پێچراوەوە کێشاوە داخوا دڵت پێم ناسووتێ؟ زمانە بچکۆلەکەم ئاوەساوە. نازانی چەندەم ئازار دەدا. ئەو گشتە من خەریکی وانەی "فیزیزلۆژی" بووم کەچی لەبارەی زمانە بچکولەوە هیچ نازانم. رەنگە دەرس خوێندن کارێکی بێکەڵك بێ.

لەوە زیاتر حەوسەڵەی نووسینم نیە. کە دادەنیشم هەموو لەشم دەلەرزێ. دیسانەوە تکات لێدەکەم سەبارت بەو نامە دوور لە ئەدەبە لێم ببورە. من هەر لە سەرەتاوە باش بەخێو نەکراوم.

لەگەڵ خۆشەویستیو رێز

جوودی ئابوت



وێنەی جودی بە سەرو ملی پێچراوەوە

له نەخۆشخانەوە

٤ی ئاوریل

بابە لاق درێژی خۆشەویست

دوێنێ پاش نیوەڕۆ هەروا کە لەنێو جێگاکەمدا دانیشتبووم‌و لە پەنجەرەوە لە ڕێژنەی بارانم دەڕوانی‌و هەستم دەکرد لە ژیان وەڕەز بووم، لەپڕ خانمی "نێرس" بە بەستەیەکی سپیی درێژی پڕ لە گوڵی سووری زۆر جوانەوە کە ناوی منی لەسەر نووسرابوو، هات لە دەرگای دا. بێگەردترو جوانتر لە گوڵەکان ئەو دێڕە وردو لەبەر دڵانە بوو کە بەسەر کارتێکەوە نووسرابوو.

بابە گیان! پڕ بەم جیهانە سپاس.

ئەو گوڵانە یەکەمین گوڵێکن کە بە درێژایی ژیانم لە کەسێکەوە پێم دەگەن. ئەگەر بتەوێ بزانی تا چ ڕادەیەك منداڵم هەر ئێستا بۆت دەنووسم ... من ڕاکشام‌و لەوپەڕی شەوق‌و زەوقدا زووڕە زووڕ دەستم بە گریان کرد.

ئێستا خاترجەم بووم کە نامەکانم دەخوێنیەوە. لەمەولا تێدەکۆشم باشترو سەرنج ڕاکێشتر بنووسم بە چەشنێك کە تۆ پێت خۆش بێ‌و نامەکانم بە تێلم(1)ی سوور بەستەبەندی بکەی‌و لای خۆت ڕایانگری. بەڵام تکات لێ دەکەم نامەی گورینیان لەنێو دەرێنەو بیسووتێنە. چەند خۆش دەبوو ئەگە هەرگیز ئەو

---

(1) تێلم: پارچەی باریك‌و کەمێك درێژ، نەوار، نەواری پارچەیی

نامەیەت نەخوێندایەتەوە.

زۆرت سپاس دەکەم بەتایبەت سەبارەت بەوەی کە نەخۆشێکی قەڵس‌و بەستەزمانت خۆشحاڵ کرد. بێگومان تۆ هاوڕێ‌و کەسوکاری زۆرت هەیە کە هەموویان خۆشیان دەوێی، بۆیە حەقت دەدەمێ کە

دەردی تەنیایی سەرنجی ڕانەکێشاوی‌و نازانی تەنیابوون چەند ناخۆشە. بەڵام من دەردی تەنیایی‌و تەنیابوون بە باشی هەست پێ دەکەم.

خوات لەگەڵ

بەڵێنیت دەدەمێ کە ئیدی خراپ نەبم، چونکی دڵنیام تۆ ئینسانێکی ڕاستەقینەی. بەڵێنیش دەدەم کە لەمە بەدوا بە پرسیارەکانی خۆم وەڕەزت نەکەم.

بچووکی هەتا هەتاییت ـ جوودی

## دووشەممە، زەنگی هەشتەم

بابه لاق درێژی خۆشەویست هیوادارم تۆ ئەو ئەمیندارو باوەڕپێکراوە نەبی کە لەسەر بۆقێك دانیشت؟!
دەیانگوت بۆقێك لەژێر بەرێزێك دا" گرم وەك بومبا تەقیو شەقی برد. کەوابێ دەبێ کەسێکی زۆر لەتۆ قەڵەوتر بووبێ.
ڕەنگە لەبیرتان مابێ کە لە دامەزراوەی "جان گریر"دا، نزیکی پەنجەرەی جلشۆرخانە چەند دەلاقەی تێدا بوو کە بە چوارچێوەی دارو بە شێوەی تۆڕ واتە کونکون سازکرابوو. بەهاری هەموو ساڵێك لە وەرزی بۆقدا، بۆقێکی زۆرمان کۆ دەکردەوەو لەو کونانەمان دەکردن. جاروبار بۆقەکان وزاق[1]یان دەدا، دەکەوتنە نێو جلشۆرخانەوەو قیرەو هەرایان دەست پێ دەکرد. هەر بەهۆی ئەو کارەوە چەند جار سزا دراین، بەڵام بەو حاڵەش دیسان بۆقەکانمان کۆ دەکردەوە. سەرئەنجام ڕۆژێکیان ـ هیوادارم ئەو قسانە نەبێتە هۆی وەڕەزیت ـ نازانم چۆن بوو کە یەکێك لە قەڵەوترین و گەورەترین بۆقەکان لەسەر یەکێك لە موبلە چەرمیەکان، لە ژووری ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەریدا دۆزرایەوە. دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کاتێ کومیسیۆنی ... بەڵام بۆچی بنووسم. تۆ خۆت لەوێ بوویو لە هەموو شتێك ئاگاداری.
بەڕاستی نازانم ئەم شتانەم بۆ بە بیردا دێتەوە. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە وەرزی بەهارەو بۆقەکان سەریان هەڵداوەتەوە. ئێستا بۆیە بۆق کۆ ناکەمەوە چونکە

---

[1] وزاق: بازدانی بەتەوژم

لێرە هیچ یاسایەك پێشگیری لەو کارە ناکا.

## سێشەممە، پاش کلیسا

دەزانی من چ کتێبێکم پێ خۆشە؟ (مەبەستم هەر ئێستایە چونکە هەر بە سێ رۆژ جارێك بۆچوونم لەبارەی کتێبێکەوە دەگۆڕێ) "وودرینگ هایتز"[1] کە نووسەرەکەی "ئیمیلی برونتە"[2]یە. کاتێك ئیمیلی برونتە ئەو کتێبەی نووسی زۆر لاو بوو تا ئەو رۆژەش لە "هاورت"[3] پێی نەنابووە دەرەوە. ئەو لەگەڵ هیچ پیاوێکیش ئاشنا نەبوو. ئێستا چۆن توانیویە کەسایەتی‌یەکی وەك "هیت کلیف"[4] بخولقێنێ، هەر خوا دەیزانێ.

جاروبار لە سەرم دەدا کە بە هیچ شێوەیەك مرخ و ئیستعدادی نووسەریم تێدا نیە. ئەگەر نەبم بە نووسەرێکی گەورە بێگومان تۆ زۆرت پێ ناخۆش دەبێ. وەنا؟

بابەگیان! لەم هەوا بێگەردە بەهاریەدا کە هەموو شت رازاوەتەوە، رایەخی سەوزی چیمەن راخراوەو خونچەو چرۆ لە لقوپۆپی دارەکانەوە سەریان دەرهێناوە، پێم خۆشە وانەو ئەرکەکانی زانکۆ وەلانێم و روو لە دەشت و چیا کەم و پەنا بۆ سروشت بەرم. دەشت و چیاو سروشت چەند پڕ لەرەمز و رازن. ژیان چەندە تژی‌تر لە رەمز و راز و چەند بەسەرهات خوالقێنی تر دەبێ ئەگەر لەگەڵ ئەم بەشی سروشتەدا تێکەڵ بین. تام و چێژی ژیان ئەمەیە نەك نووسینی کتێب.

---

[1] Wvthering Heights
[2] Emily Bronte
[3] Hawrth
[4] Heathcliff



وێنەی هەزارپێ

ئای ی !!!

ئەمە دەنگو قیژەی "سالی"و "جولیا" بوو کە دەیانزانی نامە بۆ تۆ دەنووسمو هێشتا دوایین رستەم تەواو نەکردبوو کە دەنگی ئەوان بەرز بۆوە. لەو کاتەدا هەزارپێیەك وەکوو ئەو وێنەی کە دەیبینی، بەڵکوو ناشیرینتر لە میچی ژوورەکەوە "شلپ" کەوتە پەنای من لە حاڵێکدا لە ترسان خۆم لێ دوور دەخستەوە، دوو پیاڵە چایم لەسەر مێزەکە خستە خوارەوە.

"سالی" بە پشتی "برۆس"[1] دای بەسەر هەزارپادا. ئیدی بێزم نایە دەست لەو برۆسە بدەم. بەڵام تەنیا لای سەری پانەوە بوو. باقی لەشی خزایە ژێر مێزی توالیتەکە.

چونکە ئەم بینایە کۆنەو دیوارەکانی بەگیای چنگنە[2] داپۆشراوە، هەزارپای

---

[1] برۆس: جۆرێك شانە

[2] چنگنە: جۆرە گیایەکی بە دیوارەوە دەنووسێ هەموو دیوار دادەپۆشێ

زۆرە.

دیتنــی هــەزارپا مرۆڤــ بێــزار دەکــا. مــن پێمخۆشــە "بــەور" لــەژێر کورسی‌یەکەمدا بێ، نەك هەزارپا.

هەینی ۹:۳۰ خولەکی پاش نیوەڕۆ

ئەم هەموو دەردیسەری‌یە!! بەیانی زەنگی مەدرەسەم گوێ لێ نـەبوو. ئەوەنـدە بە پەلە بووم کە قەیتانی پێڵاوەکەم بچڕا، جێدوگمـەی یەخـەم دادڕاو دڕەنگـیش گەیشتمە سەر مێزی بەر چاپی. سەرەنجام زەنگـی یەکـەم لـەکاتی خـۆیدا لەسـەر کەلاس ئامادە نەبووم.

لـەبیرم چـوو مـژۆك[1]ی جەوهـەر لەگـەڵ خـۆم ببـەم، پێنووسـە پاندانەکـەم جەوهـەری دەدەلاند. لـە زەنگـی سـێگۆش (مثلثات)دا لەگـەڵ مامۆسـتاکەم کێشەمان بوو. مەسەلەکە لەسەر "لگاریتم" بـوو. پاشـان کـە تەماشـای کتێـبم کرد قسەی ئەو بوو.

بۆ ژەمی نیوەڕۆ گۆشتی کولاّ و نانی موورەباییمان هەبوو. من هیچیـانم پـێ خۆش نیە. تامیـان وەك چێشتەکانی "هەتیوخانە"یـە. پۆسـتیش تـەنیا لیسـتەی حیسابی بۆ هێنام. ئەگەرچی نامەیەك بۆ مـن نایـەو مـن بنەماڵەیـەکم نیـە کـە نامەم بۆ بنێرن.

پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ شیعرێکی ئینگلیسی‌یان داینێ کـە راڤـەی بکـەین. مـن نازانم هونەری ئەو هونراوەیە چ کەسێکەو هونراوەکەی چ مانایەکی هەیە. کاتێك چوومە ژووری دەرس خوێندن، هونراوەکەیان لەسـەر تەختەڕەش نووسیبوو:

---

[1] مژۆك: جەوهەرمژ، مەرەکەب مژ لەسەر کاغەز، خوشکن

"من شتێکی دیکەم نەویست
خۆبواردنو ئینکارێکی دیکەش نەبوو
من پێشنیاری بوونی ئەوەم دابوو
بازرگان زەردەیەکی گرت
برزیل؟ ئەو دوگمەی سووڕاند
بێڕوانینو ئاماژەیەك بە رێگای من
بەڵام خاتوون ئایا شتێکی دیکەش هەیە،
کە ئێمە ئەمڕۆ نیشانی بدەین؟"

زۆر بە پەلە لە ئێمەیان ویست کە ئەو شیعرە راڤە بکەین. من هەرچەندم خوێندەوە هیچی لێ تێنەگەیشتم. تەنیا من نەبووم کە هەرم لە بڕی نەکردەوە. بەڵکوو گشت خوێندکارەکان تووشی ئەو دەردیسەرییە ببوون. ماوەی ۲۵ خولەك خوێندکارەکان لەو تەختە رەشەیان روانی. هیچکەس تاکە وشەیەکی لەسەر کاغەز نەنووسی. ئەم دەرسانە چەندە گرانن. وا نەزانی دەردەسەر تەواو بوو. هێشتا درێژەی هەیە.

باران دەستی بە بارین کردو ئێمە نەمانتوانی یاریی "گوڵف" بکەین. لەباتی ئەوە چووینە ژووری "ژیمناستیك". کچێکی پەنا دەستم بە داردەستێکی "هێندی"بەقەو دای بە ئەنیشکم دا. کاتێك گەڕامەوە ژوورەکەم دیتم جلە شینە بەهاریەکەم کە بە دروونم دابوو، بۆیان ناردبوومەوە، بەڵام داوێنەکەی ئەوەندە تەنگ بوو کە نەمدەتوانی پێوەی دانیشم.

هەینی رۆژی پاكو خاوێنیو گسك لێدانە. خزمەتچی هەموو کاغەزی سەر مێزەکەمی پرشو بڵاو کردبۆوە. ئەمشەو لە کلیسا ۲۰ دەقیقە زیاتر لە جاران رایانگرتین. سەرەنجام کاتێك گەیشتمە ژوورەکەمو پشوویەکم بە بەردا هاتەوەو

ویستم دەست بکەم بە خوێندنەوەی کتێبی "سیمای ژنێک"، کچێك بەناوی "ئاکرلی" کە چونکە ناوی ئەویش بە پیتی "ئا" دەست پێ دەکا، لە کەلاسی لاتین دا لەپەنای مندا دادەنیشێ، هاتە ژوورەکەم (بریا خاتوو لیپت ناوی دەنام "یابراسکی"، کە "ی" دوایەمین پیتی ئەلفو بێیە). پرسیاری کرد رۆژی دووشەممە لاپەڕەی ٦٩ دەخوێنین یان لاپەڕەی ٧٠. سەعاتێك دانیشتو هەر ئێستا رۆیشت. کچێکی زۆر بێ مرخە. هیچکات ئەوەندە نارەحەتیی یەك لەدوای یەکت بیستووە؟ ئاستەنگە گەورەکان نین کە پێویستیان بە سەبرو حەوسەلەیە، بەڵکوو ئەم پێشهاتە بچوکانەن کە دەبێ بە پێکەنینەوە لەگەڵیان رووبەڕوو بی‌و تەحەمولیان بکەی. جەرگی پیاو دەخۆن. من دەمەوێ خاوەنی حەوسەلەیەکی وا بم. دەمەوێ بەخۆم بیسەلمێنم کە ژیان شانۆیەکی یارییە. من دەبێ یاریزانێکی باش‌و کارامە بم. براوە بم یان دۆڕاو دەبێ شانی ژێردەم‌و پێکەنم. لەمە بەدوا ئەگەر "جولیا" گۆرەوی ئاورێشم لەپێ بکا، یان هەزارپایەك لەسەرمیچەوە بکەوێتە خوارەوە، قەت سکاڵایەك لەمن نابیستی.

جودیی تۆ

بابە زوو وەڵامم بدەیەوە.

**٢٨ی مانگی مەی**

**گەورەم بابە لاق درێژ**

نامەیەکم لە خاتوو "لیپت"ـەوە پێگەیشتووە. لوتفیان فەرمووەو هیوایان دەربڕیوە کە لە وانەکانمدا سەرکەوتنی شایانم بەدەست هێنابێ. هەروەها فەرموویانە لەبەر ئەوەی من لە پشووی هاویندا شوێنێك شك نابەم، ئەوان ئامادەن تا کرانەوەی زانکۆ، لە بەرامبەر کارکردن لە هەتیوخانەدا خەرجیی خۆم دابین بکەم.

بەڵام من لە بینای "جان گریر" بێزارم. مردنم لا ئاسانترە تا بگەڕێمەوە ئەو شوێنە.

جیرۆشای راستگۆی تۆ

چونکو تا ئێستا بە درێژایی تەمەنم هەرگیز "ئیلاّح"م نەدیتووە، لە گەڕانەوە بۆ بنیادی "جان گریر"و بە درێژایی هاوین قاپو قاچاخ شتن بەڕاستی بێزارم. دەترسێم بگەڕێمەوە بۆ ئەوێو رووداوێکی ناخۆش روو بدا. چونکە من ئێستا ئەو کچە شەرمنەی جاران نیمو لەوانەیە کەلوپەلی هەتیوخانە هەرچم بەدەست بکەوێ بیانشکێنم.

لەوەی کە نامەکەم زۆر کورتە لێم ببوورە. ناتوانم هەواڵی نوێت بۆ بنووسم. چونکە لە کلاسی وانەی فەڕانسەم. دەترسێم لە پڕێکدا مامۆستا بانگم بکا.

ئەوەتا بانگی کردم

خوات لەگەڵ

ئەو کەسەی تۆی زۆر خۆش دەوێ

"جوودی"

Cher Daddy-Jambes-Longes[1]

Vous etes un brek!

Je suis tres heureuse about the farm pers que je naz jamais been on a farm dan ma vie and g'd: hate to retaurner chez gohaon grier, et wosh dishcs tout lete. There would be danger of quelque chose affreuse hoppen ing parseque joiqerdue mie humilite dautre fois et j, ai peur that i would just break out quelque jour et smash eyery cup and saucer dans la maison.

Pardon brievete et paper. ge ae peux pa seud et jai peur que Monsieur le Professeur is going to coll on tout de suite.

He did!

ou revoir

ge vous oimc beaucoup

Judy

---

[1] ئەم نامەیە تێکەڵاوێکە لە فەرانسی‌و ئینگلیسی "جوودی" چونکە زمانی فەرانسی تازە فێربووە، هەندێك لە وشەکانی ئەم زمانەی بە هەڵە نووسیوە.

## ٣٠ مانگی مەی

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

تۆ باخی زانکۆت دیوە؟ لە مانگی مەیدا بەهەشتی خوایە. تەواوی باخ یەکپارچە گوڵە. تەنانەت دارە کاژە کۆنەکانیش تەڕو تەرچك دێنە بەرچاو. گوڵە زەردو سوورەکان‌و بە سەدان کیژ، بە جلوبەرگی کەسك، سپی‌و پەمەیی‌یەوە، چیمەنی مەخمەرینیان بە جوانترین شێوە رازانۆتەوە، تماشای هەر کەس بکەی، شادو بێخەمە. چونکی کاتی پشووی هاوین نزیك بۆتەوە. ئەم شادیە بەرادەیەك گەورەیە کە خەمی تاقیکردنەوەکان لەبیر چۆتەوە.

بابەگیان! من لە هەموان شادترم چونکە نە لە هەتیوخانەم‌و نە ئەرکی ئاگاداربوون لە منداڵانم لەسەر شانە، نە لەسەر ماشین تایپ کار دەکەم نە ئەرکی کتێبخانە بەڕێوە دەبەم (دیارە هەمووی بەهۆی تۆوەیە) ئەگەر تۆ نەبای بێگومان ئەرکی یەکێ: لەو کارانەم بەڕێوە دەبرد.

- من لە خراپییەکانی رابووردووم بەداخم.
- لەوەی بەرێزەوە لە خاتوو "لیپت" نەدەدوام بەداخم.
- لەوەی کە جاروبار لە "فیردی پیرکین"م دەدا بەداخم.
- لەوەی کە پشتەملە لاسایی بڕواپێکراوانم دەکردەوە بەداخم.

دەمەوێ لەمەبەدوا سەبارەت بە هەموو کەس دلۆڤان، بەئەدەب‌و لێبوردە بم. چونکە ئێستا بەختەوەرم‌و لەم هاوینەدا کاری نووسەری دەست پێ دەکەم. دەنووسم بۆ ئەوەی ببمە نووسەرێکی گەورە.

دەبینی هێزی دەروونیی من چۆن دەیهەوێ بەهێز بێ؟

وا هەست دەکەم ئەم هێزە لەگیانی هەمواندا هەیە. من ئەوەم قبووڵ نیـە کـە بێـدەرەتانی، ناهومێـدیو هـەژاری دەبنـە هـۆی گەشـەکردنی هێـزی ئیخلاقـی، بەڵکوو ئەوە کسانی بەختـەوەرو خۆشـحاڵن کـە بـە سـەخاوەتەوە خۆشەویسـتیو شادی بە خەڵك دەبەخشن. من بـڕوام بـەو کەسـانە نیـە کـە ڕەشـبینن‌و لـە ژیـان بێزارن.

بابە! هیوادارم سەبارەت بە ژیان ڕەشبین نەبی.

لە باخی زانکۆ دەدوام. بریا تاقە جارێك سەرت لێ هەڵدینام، کـە بـۆ گـەڕان ئەبردای بۆ نێو باخی زانکۆو شوێنەکانم نیشان دەدایو دەمگوت:

بابە گیان! ئێرە کتێبخانەیە، ئێرەش ناوەنـدی گـازە. ئـەم بینایـە بـە سـەبکی "گوتیك" ساز کراوە. دەسـتی چـەپ ژووری ژیمناسـتیکە. ئـەم بینایـەش کـە بـە شێوەی "تیودۆر"ـەکان دروست کراوە دەرمانخانەیە.

ئێمە بەم شێوەیە خەڵك بەنێو زانکۆدا دەگێڕین جێگا جۆربـەجۆرەکانیان پـێ دەناسێنین. من زۆر باش لە عۆدەی ئەو کارە دێم. چونکە تەمـەنێك لە هەتیوخانە ئەو کارەم کردووە. باوەڕ بکە ئەمڕۆ لە بەیانیەوە تـا پـاش نیـوەڕۆ خـەریکی ئـەو کارە بووم. ئەویش لەگەڵ پیاوێکدا...

تا ئێستا لەگەڵ هیچ پیاوێکدا نەدواوم (دیارە بێجگـە لـە خێـرەو مەنـدان‌و ئەمیندارانی، ئەویش جاروبار کە دیارە بە حیسـابی نـەهێنم چـاترە). بابـە! داوای لێبوردن دەکەم کە بەم شێوەیە سەبارەت بە دەستەی خێرەومەندن‌و باوەڕپێکراوان زماندرێـژی دەکـەم. مەبەسـتم ئیهانـە پێکردنیـان نیـە. هـیچ پـێم خـۆش نیـە مسقاڵێك دڵی تۆم لێ بێشێ. نازانم بۆچی ناتوانم تۆ وەك ئـەوانی دیکـە دابنـێم. پێمـوایـە بەرێکـەوت لەگـەڵ ئەوانـە کـەوتووی. ئـەوان زیاتریـان قەڵـەون‌و بـە

میهرەبانی دەست بەسەر مرۆڤدا دێنن‌و زریزەی کاتژمێرەکانیشیان زێڕە. ئەم وێنەیە کە پێشکەشی دەکەم وێنەی ئەندامانی خێرخوازو باوەڕپێکراوانە بێجگە لە تۆ.



وێنەی خێرخوزان

با لەوە گەڕێین. بچینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

بەکورتی من لەگەڵ پیاوێك پیاسەم کرد، لەگەڵی دوام‌و چاییم خواردەوە. پیاوێکی بەویقارو دانامە. ئەگەر دەتەوێ ناوی بزانی، ناوی "جروی پندلتون"[1]ـە، خزمی "جولیا"و بەکورتی وەك تۆ کەڵەگەتە. بۆ ئەنجامدانی کارێکی خۆی هاتبووە ئەم دەوروبەرە. بڕیار دەدا سەرێك لە برازاکەی هەڵێنێ "جروی پندلتون"برابچووکی باوکی "جولیا"یە. بەڵام وێدەچێ "جولیا" جوان ناناسێ. ئەوانەیە کاتێك "جولیا" منداڵێکی کۆرپە بووە، مامی چاوێکی لێ کردبێ‌و هەر لەو کاتەوە خۆشی نەویستبێ‌و پاش ئەوە لێی نەپرسیبێ. هەرچۆنێك بێ بەڕێز "پندلتون" پیاوێکی زۆر بە ئەدەب‌و دانامەیە. لە ژووری

---

[1] Jeris Pendleton

میوانان کڵاوو وەکاز[1] و دەستکێشەکانی لەپەنای خۆیدا دانانو بەرامبەر من دانیشت. چونکە "جولیا"و "سالی" لە زەنگی حەوتەمدا وانەیان هەبوو نەیاندەتوانی خۆی لێ ببوێرن. "جولیا" هاتە لای منو داوای لێ کردم مامی لەنێو زانکۆدا بگێڕمو پاش تەواوبوونی دەرسەکەی تەحویلی ئەوی بدەمەوە. چونکە "پندلتون"ـەکانم خۆش ناوێ، بێ ئەوە شتەکە بە گرینگ بزانم، داواکەیم قبووڵ کرد. بەڵام ئەم بەڕێزە زۆر لەبەر دڵانو خوێنشیرینم هاتە بەرچاو. بە هیچ شێوەیەك لە "پندلتون"ـەکانی دیکە ناچێ. زۆر خۆشمان لێ رابوورد.

بریا منیش وەك "جولیا" مامێکم هەبایە. تۆ دەتەوێ بۆ ماوەیەك ببیە مامم؟ پێم وایە لە دایەگەورە باشتر بێ؟ بەڕێز "پندلتون" تۆی وەبیر دێنام، دیارە تۆی بیست ساڵ لەمەوپێش. دەبینی ئەگەرچی تۆم نەدیوە، تا چ رادەیەك لەبارەی تۆوە ئاگاییم هەیە!

بەڕێز "پندلتون" کەڵەگەتو بەژن باریکە. رەنگی پێستی روخساری هەندێك مەیلەو ئەسمەرە. چرچێکی زۆر بچووك لە گۆشەی چاویدا دەبینرێ، کاتێك پێ دەکەنێ زۆری لێ جوانە. لەو کسانەیە کە مرۆڤ وا دەزانێ تەمەنێکە دەیناسێو هیچکاتێکیش لێیان بێزار نابێ، زۆریش خۆش مەشرەفە.

پێکەوە هەموو بینای زانکۆکە گەڕاین. پاشان پێشنیاری کرد بۆ چایی خواردنەوە بچینە رێستورانی زانکۆ. ئەم رێستورانە لە پەنا زانکۆ دایەو لە شەقامی "کاژ"ەوە بۆی دەچن. من گوتم وا چاترە بچین "جولیا"و "سالی"یش بێنین، بەڵام جەنابی "پندلتون" گوتی چایی بۆ "جولیا" زۆر باش نیە. لەوانەیە ئەو تووڕە بکا. بەکورتی لەدەست ئەوان هەڵاتینو چوینە ریستوران. چای نان

[1] وەکاز ـ عەسا

شیرینی، مورەباو پاشانیش هەریەك بەستەنییەكو كێكێكمان خوارد. لەبەر ئەوەی كۆتایی مانگ بوو پارەی منداڵەكان لە كورتییدا بوو، رێستوران چۆڵ بوو.

زۆرمان خۆش لێ رابرد. بەڵام لەگەڵ گەڕانەوەمان، بەڕێز "پندلتون" ئەوەندە لە كارەكانی دواكەوتبوو كە نەیتوانی "جولیا" ببینێ. دەبیا خۆی بگەیانایەتە شەمەندەفەر. "جولیا" لەوانەبوو سەرم هەڵكەنێ كە بۆچی مامیم بردۆتە رێستوران لەوەی كە دەمزانی مامە خوێنشیرینەكەی زۆر دەوڵەمەندە خەیاڵم ئاسوودە بوو، چونكە چاییو ئەوانەی دیكەش كە خواردبوومان تەنیا بایی شەست سێنت بوو.

بەیانیی ئەمڕۆ (سێشەممە) بەهۆی پۆستی سفارشییەوە سێ بەستە شوكولاتم بۆ هات. یەكیان بۆ "جولیا" یەكێك بۆ "سالی"ی ئەوی دیكەیان بۆ من. راستی بۆچوونی تۆ لەبارەی وەرگرتنی هەدیەیەك كە لە لایەن پیاوێكەوە هاتبێ، چۆنە؟ من بەوە هەستم كرد بەجێی منداڵێكی دۆزراوەی سەرەڕێ، كچێكی تەواو ئاساییم. بریا رۆژێكیش تۆ بهاتبای، تا پێكەوە چایی بخۆینەوەو بمزانیبا خۆشم دەوێی یان نا؟ هاوار ئەگەر بەر دڵم نەكەوی. بەڵام دڵنیام كە خۆشم لێت دێ.

لەگەڵ پێشكەش كردنی رێزم

ئەو كسەی قەت لەبیرت ناكا

"جوودی"

پەراوێزی نامە:

بەیانیی ئەمڕۆ كە تەماشای ئاوێنەم كرد، چاڵێكی بچكۆلەی جوانم لەسەر گۆنام دا بینی، كە پێشتر نەبوو پێت وایە ئەو چاڵە چۆن پەیدا بوو؟

**٩ی ژوئەن**

**بابە لاق درێژی خۆشەویست**

ڕۆژێکی خۆشە. هەر ئێستا دوایەمین تاقیکردنەوەم کە فیزیۆلۆژی بوو کۆتایی هات‌و ئەمجار نۆرەی سێ مانگ پشوودانە لە "ئیلاخ"[1] . من نازانم ئیلاخ چۆن جێگایەکە. بە درێژایی تەمەنم نەچوومەتە ئیلاخ تەنانەت هەر نەشمدیوە (بێجگە لە جاروبارێک لەپشت جامی ماشینەوە) بەڵام دڵنیام کە ئیلاخ‌و ئازادیی ئەوێم زۆر پێ خۆش دەبێ. من یەشتا بە ژیانی دوور لە بنیاتی "جان گریر" ڕانەهاتووم. هەرچی بیر دەکەمەوە کە لە هەتیوخانە نیم لە خۆشیان دەلەرزێم. هەست دەکەم پێم خۆشە هەڵێم. زۆر بە خێرایی‌و خێراترو جاروباریش لا بکەمەوە بزانم داخوا خاتوو "لیپیت" دەستی بۆ لای من درێژ نەکردووە، کە بمگرێ‌و لەگەڵ خۆی بمبا!!

فەرمانەکانی تۆ هیچکات بێزارم ناکەن. چونکە مەودای نێوانی من‌و تۆ زیاتر لەوەیە کە بتوانێ ببێتە هۆی ئازاردانم. خاتوو "لیپیت"یشم بۆ هەتا هەتایی لەبیر بردۆتەوە. بنەماڵەی "سمپل"یش کە لە ئیلاخن کاریان بە خوو خدەو ڕەفتاری منەوە نیە. وانیە؟

بێگومان وایە.

بەڵێ من گەورە بووم. هورا

لێرەدا کۆتایی بە نامەکەم دێنم، چونکە دەبێ چەمەدانێک‌و سێ بەستەی

---

[1] ئیلاخ: کوێستان، هەواری کوێستانی ـ هاوینە هەوار

دیکەو کتری، قۆری، دەوری، کتێبو لەم جۆرە شتانە بپێچمەوە تا ئامادەیان بکەم.

"جودیی هەتا هەتاییت"

پەراوێز:

تاقیکردنەوەی فیزیۆلۆژی زۆر باش بوو. تۆ دەتوانی ئاوا بە باشی لە تاقیکردنەوەدا بەشدار بی؟

شەممە شەو

ئیلاخی "لاك وبلو"

من هەر ئێستا چوومە ژوورەکەی خۆمەوە. یەشتا کەلوپەلەکانم نەکردۆتەوە. بۆ کردنەوەیان زۆر بە پەلەمو لێی راناوەستم. دەموێ پێت بڵێم کە چەندە ئەم هەوارە کوێستانییەم پێ خۆشە ئێرە خاوێنترینو خۆشترین شوێنی ئەم گۆی زەوییەیە. عەمارەتێکی چوارگۆشەی وەك ئەم وێنەیە.



وێنەی بیناکە

بینایەکی کۆنە. سەدساڵ لەمەوپێش ساز کراوە لەوانەیە زیاتریش. پێشەکەی هەیوانێکە کە نەمتوانی وێنەکەی بکێشم. ئەو وێنەی کە کێشاومە دەربڕی دەقاودەقی مەبەستەکە نیە. ئەوەی کە لە باوەشین دەچێ، داری سنەوبەرە. ئەوانەی کە دڕوودڕوونو وەکوو داری کاژ دەچن، لە راستیدا داری "بی"ن. بیناکە لەسەر

گردێك درووست كراوە كە بەرجەوەندەكەی ریزە گردێكن بە درێژیی چەند فەرسەخو هەموویان بە چیمەن داپۆشراون. "لاك ویلو" بەسەر گردی یەكەمەوەیە. پێشتر هەندێك تەوبلەو ئەمبار لە درێژایی جادەكەدا هەبوون كە پێشیان بەو دیمەنە نەگرتووە، بەڵام سرووشتی میهرەبان چەند بروسكەیەكی بۆ تایبەت كردوون‌و هەمووی سووتاندوون.

ئەو كەسانەی لەم بینایەدان بریتین لە خانم‌و ئاغای "سمپل" كچێكی گەنج (حزمەتكار)و دوو حزمەتكاری پیاو. خزمەتكارەكان لە چێشتخانە نان دەخۆن. "سمپل"ـەكان‌و جوودی لە ساڵۆنی نان خواردن. ژەمی شێوی ئەمشەومان ژامبون، هێلكە، بیسكویت، كێك كە بە هەنگوین درووست كرابوو، پیرناشكی، ترشیات، پەنیر، چای شیرین‌و برێكی زۆر قسەو باس بوو. قەتم ئەوەندە خۆش لێ رانەبوردووە. هەرچی دەڵێم ئەوان دێنێتە پێكەنین. رەنگە هۆی ئەوە بێ كە من هیچكات لە ئیلاخ دا نەبووم‌و پرسیارەكانم ناشارەزایانەیە.

ئەو رۆژەی كە (وەكوو چیرۆكێكی پولیسی زەربدەری لێدراوە)، ژوورێك نیە كە كەتنی تێدا كرابێ. ئەوە ژووری منە. ژوورێكی گەورەی چوارگۆشەی چۆڵ لەگەڵ هەندێك قەنەفەی قەدیمی. سایەوانی پەنجەرەكان بە رەنگی كەسكەو پەراوێزەكانیان تەلاییە. ئەگەر بمەوێ سایەوانەكان بەرز راگرم، دەبێ داریان ژێردەم. بە ئاستەم دەستیان لێ بدرێ دەكەون.

میزێكی گەورەی نان خواردن لە ناوەڕاستی ژوورەكەدا دانراوە. پێم وایە هەموو ئەم هاوینە ئانیشكی لەسەر دادەنێم‌و كتێبەكەمی لەسەر بنووسم. بەگران تاقەت دێنم تا دنیا رووناك بێتەوە، ئەوكات بڕۆم بۆ پیاسەی دەوروبەر.

كاتژمێر ٨:٣٠ خولەكە، هەر ئێستا مۆمەكان دەكوژێنمەوەو دەنووم. خەڵك لێرە كاتژمێر پێنجی بەیانی لەخەو هەڵدەستن. زۆرم خۆش لێ رادەبرێ. بڕوا

ناکەم "جوودی" بە بەختەوەرییەکی ئاوەهایی گەیشتبێ. تۆر خوای دلۆڤان سەبارەت بە من لە رادەبەدەر میهرەبانن. دەبێ زۆر هەوڵ بدەم تاکوو بتوانم قەرەبووی ئەو هەموو خۆشەویستیەتان بکەمەوە. بەڵێن دەدەم ئەو کارە بکەم دەبینی کە ئەو کارە دەکەم.

شەوباش

جوودی

پەراوێز:

خۆزگە لێرە دەبووی‌و دەنگی گۆرانیی بۆقەکان‌و بزلە[1] خوو‌گەکانت گوێ لێدەبوو و مانگی چواردەت تەماشا دەکرد. من بە نیازی بەختەوەری‌و تەندروستی، لەلای شانی راستەوە تەماشای مانگم کرد.

[1] بزلە خووگ، بەچکەی بەراز

## ١٢ای ژوئیه ـ لاك ویلو

## بابه لاق درێژی خۆشەویست

ئەو سکرتێرەی تۆ کورنستانی "لاك ویلو" چۆن دەناسیێ؟ (ئەم پرسیارە هەروا لە گۆترە نیە، بە جیددی دەمەوێ بزانم) چونکە تکایە گوێم بۆ راگرە:

ئەم ئیلاخەو مەزراکانی، لەپێشدا هی رێـزدار "جـروی پـنـدلتون" بـووە ئـەو بەخشیویە بە خاتوو "سمپل" کە دایەنی بووە. رێکەوتێکی سـەیرە، ئێسـتاش کـە ئێستایە خاتوو "سمپل" پندلتون هەر بە بەرێز "پندلتون ناو دەبا. دەگێرنەوە کە ئەوە واتە بەرێز "جروی" منداڵێکی زۆر خوێنشیرین بـوو. ئالقەیـەك لـە تـووکی سەری "جروی" تا ئێستاش لە جری‌یەك دا هەڵگرتووە. ئەو ئالقە مووەی پیشـان دام. رەنگی قاوەیی‌یەکی ئامـاڵ سوورە. لەو کاتەوە زانیویە من بەرێز "پندلتون" دەناسم زۆر زیاتر لە جاران حورمـەتم دەگـرێ. لـە "لاك ویلـو" باشـترین پێناسـە ئاشنایی لەگەڵ یەکێك لە بنەماڵەی "پندلتون"ـە. وا دەردەکەوێ بەرێز "جـروی پندلتون" گوڵە جەرگەی بنەماڵەیەو بەختەوەرانە "جولیا" لە ریزێکی خوارەوەتر دایە.

رۆژ لەدوای رۆژ خۆشترم لێ رادەبرێ. دوێنێ سواری گاریەی گزرەکێشان بووم. لێرە سێ بەرازو نۆ بزلەی بـەرازمان هەیـە نـازانی چـەند دەخـۆن راسـت بەقـەد مالۆسێك[1]!

---

[1] مالۆس: بەرازی مێ

جوجکی مراوی‌و قەلەموونیش لە ژماردن نایەن. بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ بۆی بلوێ لە ئیلاخ دا بژی، دانیشتنی نێوشار شێتییە. کۆکردنەوەی هێلکە ئەرکی منە. دوێنێ کاتێك لە کونو کەلەبەراندا بۆ هێلکە دەگەڕام، لەسەر دارێکی تەنیشت تەویلە، کەوتمە خوارەوە ئەژنۆم برینداربوو. خاتوو "سمپل" هەروا کە خەریکی دەرمانکردن‌و پێچانی برینەکەم بوو لەژێر لێوەوە دەیگوت:

ـ هەر دەڵەی دوێنێ بوو کە بەڕێز "جروی" هەر لەسەر ئەو دارەوە کەوتە خوارەوەو ئەژنۆی بریندار بوو.

بابە! دیمەنی دەوروبەری ئێرە لە رادەبەدەر جوانە. شیو دۆڵ‌و چەم، تەپۆڵکەی بەدارو دەوەن داپۆشراوەو هەندێك دوورتر کەژە بەرزە شین باوەکان ئەوەندە جوانن کە بە دیتنیان مرۆڤ دەمی پڕ دەبێ لە ئاو.

لە حەوتوودا دوو رۆژ رۆنە کەرە دەگرین. توێ شیر لەسەر بەردێك لە ژوورێك کە بە دایم ئاو بە ژێری‌دا دەڕواو دەکرێ بڵێین ساردخانەیەکە، رادەگرین. بڕێك لە گوندنشینەکانی دەوروبەر بۆ ئەو کارە مەکینەی کەرە گرتنیان هەیە. بەڵام ئێمە ئەو ئەدای نوێخوازیەمان پێ خۆش نیە. رەنگە کەرە گرتنێکی بێ کەڵك وەرگرتن لە مەکینە کەمێك زەحمەت بێ بەڵام لە بەرامبەردا هەرزانتر تەواو دەبێ‌و تامێکی خۆشتری هەیە.

لێرە شەش گوێلکمان هەن کە من هەریەکە ناوێکم لەسەر داناون.

١ـ "سیلویا" (لەبەر ئەوە لێرە لەدایك بووە).

٢ـ "لسبیا"

٣ـ "سالی"

٤ـ "جولیا"

٥ـ "جوودی"

٦ـ بابە لاق درێژ (قەیناکا بابە گیان)؟

من وێنەیان دەکێشم تاکوو بزانی چەند ناوەکانیان لەگەڵیان دێتەوە. پەشتا کاتی ئەوەم نەبووە نووسینی چیرۆکە بێ هاوتاکەم دەست پێ بکەن. ژیان لە ئیلاخ هەموو کاتەکانم دەگرێ.

جوودی تۆ

پەراوێز:

١ ـ من فێر بووم نان بادامی ببرژێنم.

٢ ـ ئەگەر وەختایەك پێت خۆش بوو کاری مریشك بەخێو کردن بکەی، پێشنیارت پێ دەکەم لە رەچەڵەکی "ئورینگتون" کەڵك وەرگرە. ئەو نەژادە پەروپۆی دڕکاوییان نیە.

٣ ـ خۆزگە دەمتوانی کەمێ: لەو رۆنە کەرەی کە دوێنێ لە تورێی شیر گرتوومانە، بۆ دەناردی. من ئێستا لە بواری سپیایی(1)دا پسپۆرم.

٤ ـ ئەمە وێنەی خاتوو "جیرۆشا ئابۆت" نووسەری بەناوبانگی داهاتووە کە شوانی گاگەلە.



---

(1) سپیایی: شیرەمەنی

وێنەی گاگەڵەکەو جیرۆشا

یەکشەممە

بابە لاق درێژی ئازیز

پێت سەیر نیە؟ دوێنێ پاش نیوەڕۆ دەستم کرد بە نامەنووسین بۆ تۆ. لەگەڵ نووسیم بابە لاق درێژی خۆشەویست وەبیرم هاتەوە بەڵێنیم دابوو بۆ ژەمی شێو تووفەرەنگی بچنم. کاغەزەکەم لەسەر مێز داناو رۆشتم. ئەمڕۆ کاتێك هاتمەوە نامەکە بنووسم، پێت وایە چی لەسەر کاغەزەکە بوو؟ بابە لاق درێژێکی راستەقینە!



وێنەی جاڵجاڵۆوکە

هەرگیز دڵم نەدەهات ئازاری بدەم. چونکە تۆی خۆشەویستی وەبیرم دادێنا. بەسپایی لاقێکیم گرتو خستمە ئەودیوی پەنجەرەکەوە.بەیانی چادری گاریمان کێشا خوارەوەو چووین بۆ کلیسا؟ کلیسا بینایەکی خاوێنی سپیی بچووکە کە

منارەیەکی لەسەرەو سێ ئەستونی "ئیونیک" لەوانەیە "دوریک"[1]یش بن، (من هیچکات ئەو دارانە لێك جیا ناکەمەوە) لە پێشەکەی دایە. وتاری دینیو دوعای کەشیش هەموانی وەخەونووچکە خستبوو. دەستەیەك بەدەم وەنەوزەوە باوەشێنی دەموچاوی خۆیان دەکرد. بێجگە لە دەنگی کەشیش، جیكو هۆڕی سیسرکەو کوللەکان لە دەرەوە دەبیستران. کاتێك بە خۆمدا هاتمەوە، دیم راست راوەستاومو خەریکم سروود دەخوێنم. لەوەی کە وتاری کەشیشم نەبیستبوو بەداخ بووم.

زۆرم پێ خۆش بوو دەروونناسیم بە باشی بزانیبا تا پەیم[1] بەوە بردبا کە هۆی هەڵبژاردنی ئەو سرووده چی بووە.

وەرن با هەموو خۆشییەکانی جیهان وەلانێینو

لە خۆشیەکانی ئاسمانی دا لەگەڵ من پێکەوە بین

ئەگینا هاورێی خۆشەویست بۆ هەتا هەتایی بە دۆعا

من دەهێڵم تۆ بە قوولایی جەهەنەمدا بچیتە خوارەوە

لەگەڵ "سمپل"ـەکان دووان لەبارەی ئایینەوە دوور لە مەترسی نیە، خودای ئەوان (کە بێ دەستکاری کراو لە باپیرانیانەوە بەمیرات بۆیان ماوەتەوە)، بەرچاوتەنگ، دوور لە مەنتیق، نادادوەر، خەسیس، رقێنو دەمارگرژە. شوکور بۆ خوا کە من هیچ خوایەکم لە هیچ کەسەوە بە میرات پێنەگەیشتووە. من ئازادم خوای خۆم بەو شێوەیە کە دڵم دەیەوێ هەڵبژێرم. خوای من بەخشەندە، دلۆڤان، لێبوردەو زۆریش زاناو ژیرە.

---

[1] ئیونیكو دووریك دوو جۆرە کۆڵەکەن کە لە بینا گەورەکانی یوناندا لەکاریان هێناون

[1] پەی: پەی بردن، کەشف کردن

من "سمپل"ەکانم زۆر خۆشدەوێ. ئەوان لەکاری عەمەلی زیاتر ئەزموونیان هەیە تا کاری زانستی. پێم وایە ئەوان لە خواکەیان باشترن. ئەمەم بە خۆشیان گوت. ئەوان گوتیان گوایە من کافرم، منیش ئەوان بە کافر دەزانم. هەرچۆنێك بێ بڕیارمان دا لەبارەی ئایینەوە لەگەڵ یەك نەدوێین.

ئێستا پاش نیوەڕۆی یەکشەممەیە.

ئاماسی (خزمەتکار) بە کراواتی بنەوش، دەستکێشی چەرمی زەرد، سەرو ڕیشی تاشراوو ئەو ڕوخسارە سوورەیەوە لەگەڵ "کاری" (قەرەواش) کە ئەویش کڵاوێکی گەورەی لەسەر ناوەو بە چەند گوڵی سوور ڕازاندوویەتەوە، جلوبەرگی شینی لەبەردایەو قژەکانی لول کردووە، پێکەوە ڕۆیشتین.

ئاماسی لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ گاریی دەشۆرد. کاریش نەهات بۆ کلیسا کە گوایە نانی نیوەڕۆ ئامادە بکا. بەڵام لە ڕاستیدا دەیویست جلوبەرگی خۆی ئوتوو لێ بدا کە پاش نیوەڕۆ لەگەڵ ئاماسی بچنە دەرەوە.

دوو خولەکی تر ئەم نامەیە کۆتایی پێ دێ‌و دەمەوێ بچم ئەو کتێبەی کە لە ژووری ژێر هەیوانەکەدا دۆزیمەوە بیهێنم‌و بیخوێنمەوە. ناوی کتێب "لەسەر شوێنی پێ"یەو لەپشت لاپەڕەی یەکەمدا بە خەتێکی مندالانە نووسراوە "جروی پندلتون". کاتێك کە بەڕێز "پندلتون" یازدەساڵان بووە، پاش نەخۆشینێك، دەورەی حەسانەوەی لە هاویندا لەوێ ڕابواردووە. وا دیارە ئەم کتێبەی لێرە بەجێ هێشتبێ. واش دەر دەکەوێ کە بە سەرنجەوە خوێندبێتیەوە. چونکە جێگای پەنجە پیسەکانی لەسەر لاپەڕەکان دەبینرێ. هەندێ کەلوپەلی دیکەم لە ژووری ژێر هەیواندا دیوەتەوە. وەك جەنجەرێکی بیر، ئاسیاوێکی "با"و تیروکەوانێك. خاتوو "سمپل" ئەوەندە لە بەڕێز "جروی" دەدوێ کە من ئێستا بەجێی ئەو "پندلتون"ـەی کە ئێستا گەورە بووەو کڵاوی ئاوریشمی لەسەر دەنێ‌و وەکاز بەدەستەوە دەگرێ، منداڵێکم بەبیردا دێ، چروچاوێکی چلکن‌و قژی ئاڵۆزاوەوە کە بە تەقو هۆڕ بە پلکانەکاندا دەڕوا، دەرکەکان

بەقەو دەکاتەوەو دایم پەڵپ[1]ی نانشیرینی دەگرێ (بەوجۆرەی خاتوو "سەپل"م ناسیوە هەرکات داوای نانشیرینی کردبێ، داویەتێ).

بەو پێیە کە خاتوو "سەپل" لەبارەی ئەوەوە دەدوا وا دەردەکەوت کە "جەروی پندلتون" منداڵێکی تۆگری رووداو، بوێرو راستگۆ بووە. چەند جێگای داخە کە لە بنەماڵەی "پندلتون"ـە.

لە سبەینێوە مەکینەیەکی هەڵم و سێ کرێکار بۆ کوتانی نیسك بە دەستەی ئێمە زیاد دەبێ. بەداخێکی زۆرەوە پێتان رادەگەیەنم کە مانگا بەڵەك (دایکی سبیا) کەتنێکی خراپی کردووە. شەوی هەینی چووەتە نێو باخی میوە، ئەوەندی سێو خواردبوو کە دوو رۆژی تەواو گێژو سەرخۆش بوو. بڕوام پێ بکە بەڕاستمە. تا ئێستا بیستبووت کەسێك کارێکی وا دزێو بکا؟

۱۵ی سێپتامبر

بابەگیان دوێنێ بە شایەنی ئاردکێشانی دووکانی بەقاڵی خۆم کێشا، نۆ پۆند کێشم زیادی کردووە. بۆ پاراستنی لەشساخی "لاك ویلو" شوێنێکی باشە.

جوودی هەتا هەتایی تۆ



وێنەی جودی کە زۆر قەڵەو بووو وێنەی لاوازیەکەی

---

[1] پەڵپ: بیانوو

**٢٥ی سێپتامبر**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

بیری لێ بکەوە. من ئێستا لە ساڵی دوویەمی زانکۆدام. هەینیی رابووردوو گەڕامەوە بۆ زانکۆ. پێم خۆش نەبوو "لاك ویلو" بەجێ بێڵم. بەڵام بە دیتنی زانکۆ زۆر خۆشحاڵ بووم. گەڕانەوە بۆ دەوروبەرێکی ئاشنا زۆر خۆشە. من لێرە هەست بە ئارامی دەکەم. وەك ئەوەی هەموو جیهان هی منەو بەشێکم لەم جیهانە، نەك ئەوە بە قاچاخی رێگام تێی کەوتبێ. وا نازانم لە مەبەستەکەم تێگەیشتبی. کەسانێکی وەك تۆ ناتوانن لە هەستو سۆزی مرۆڤێکی بێدەرەتانی وەك من کە لەسەر رێگا دۆزراوەتەوە تێبگەن.

بابە گیان! دەزانی ئێستە لەگەڵ کێ هاوماڵین؟ لەگەڵ "سالی مەکبراید"و "جولیا پندلتون" ، باوەڕ بکە بەڕاستمە. ئێمە ژوورێکی خوێندنەوەو سێ ژووری بچووکی نووستنمان هەیە فەموو ئەمەش وێنەکەی.

بەهاری ساڵی رابووردوو منو "سالی" بڕیارمان دا هاوماڵ بینو "جولیا" دەیویست بە هەر شێوەیەك بۆی بکرێ لەگەڵ "سالی" بێ. نازانم بۆچی، چونکە هیچ لێکچوونێك لەنێوان ئەواندا نیە. "پندلتون"ەکان خۆپارێزو راڕایی‌و بە هەواو هەوەسنو زۆر جار بۆچوونەکانیان دەگۆڕن، هەرچۆنێك بێ ئێستا پێکەوەین. بیهێنە بەرچاوی خۆت "جیرۆشا ئابۆت"ی هەتیوی نیشتەجێی لەمەوپێشی "جان گریر" هاوژوورە لەگەڵ "پندلتون"ێك. بەڕاستی ئێرە وڵاتی ئازادییە.

"سالی" لە هەوڵ دایە ببێتە "ئەرشەد"ی کەلاس. ئەگەر پلانەکەی بەپێی دڵخواز بچێتە پێش، هەڵدەبژێردرێ. نازانی چ جۆرە سیاسەتێك بەکار دێنین تا

کارەکان ڕاستەو پاستە بکەین. ئێمە ئێستا کەسانێکی سیاسەتزانمان لێ دەر هاتووە. ڕاستی بابە! ئەگەر ڕۆژێك ئێمە (ژنان) مافی خۆمان بەدەست بێنین، ئێوە (پیاوان) دەبێ زۆر ئاگاداری خۆتان بن کە سەرتان بێ‌کڵاو نەمێنێتەوە.

هەڵبژاردن ڕۆژی شەممەی دادێ دەست پێ دەکاو هەر دەستەیەك بیباتەوە، کچەکان بێ‌جیاوازی بۆ دانان، لالە بەدەست وەڕێدەکەون.

شیمی یەکێك لە وانەکانی ئەمساڵی ئێمەیە. وانەیەك کە بۆ من زۆر نامۆو بێگانەیە. لە هیچ یەك لە وانەکانی پێشوومان ناچێ. پەیوەندی بە "مولوکول"و "ئەتۆم"و ئەو جۆرە شتانەوە هەیە. دیارە کاتێك بە باشی دەتوانم لێی بدوێم کە هەندێك زیاترم لێ خوێندبێ.

ئەمساڵ بێجگە لە شیمی وانەی "لوژیك"[1]یشمان هەیە.

هەروەها مێژووی گشتی‌و ...

نمایشنامەکانی "ویلیام شکسپیر"،

لەگەڵ وانەی فرانسە.

پێم وایە ئەگەر چەند ساڵی دیکە بەم ئاوایە بچێتە پێش، وەك مرۆڤێکی بە ئاوەزو زانا لەکڵ دەردێم. پێم باش بوو بەجێی وانەی فرانسە زانستی ئابووری بخوێنم بەڵام ترسام لەو کارە کە نەکا مامۆستای دەرسی فرانسە، رفووزەم بکا. ئەمساڵیش بەگران قبووڵ بووم. هۆکەشی ئەوەیە کە بناخەی ئەم دەرسەم لە کەلاسەکانی ناوەندییەوە لاواز بووە. یەکێك لە کچەکانی کەلاس وەك زمانی زگماکی بە زمانی فرانسە دەدوێ. چونکە بە منداڵی لەگەڵ دایكو بابی سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردووەو سێ ساڵ لە یەکێك لە فێرگەکانی "تەرکی دنیا" ژیاوە.

---

[1] لۆژیك: مەنتیق

بیری لێ بکەوە کە وانەی فرانسەی ئەو چەند لە هی ئێمە باشترە. کردارە بێقاعیدەکان بۆ ئەو وەك کایەی منداڵانە.

بریا کاتێك منداڵ بووم دایكو بابم لە بری ئەوەی بمبەنە هەتیوخانە، بۆ ئەم جۆرە شوێنانەیان ناردبام بەڵام نا ... چونکە ئەگەر وایان کردبا، ئێستا من تۆم نەدەناسی. ناسینی تۆ بۆ من لە وانەی فرانسە باشترە.

خوات لەگەڵ بابە. من دەبێ "هاریت مارتین" ببینمو پاش ئەوە هەندێك لەبارەی وانەی شیمیەوە پێکەوە دوایین، زۆر ئاقڵانەو بە پارێزەوە چەند شەیەکیش لەبارەی هەڵبژاردنی "ئەرشەد"ی کەلاسەوە لەگەڵی باس بکەم.

بچووکی سیاسەتوانی تۆ

ج ئابووت

## ١٧ی ئۆکتۆبر

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

ئەگەر حەوزی مەلەوانگەکەی تۆ پڕ کەن لە دەڵەمە (ژلە)ی لیمۆ، ئەوکات کەسێك بیهەوێ مەلەی تێدا بکا، داخوا دەتوانێ خۆی لەسەر راگرێ یان نوقم دەبێ؟ ئەمشەو "دێسێر"ی دەڵەمەی لیمۆمان هەبوو. هەر ئەو کاتە ئەم باسە هاتە ئاراوە. نیو کاتژمێرێك لەوبارەوە وتووێژمان بوو. ئاخرەکەشی ئاکامێکمان لە قسەکانمان دەست نەکەوت. "سالی" پێی وابوو کە دەکرێ مەلەی تێدا بکرێ، بەلاّم من پێم وایە پسپۆڕترین مەلەوانیش تێدا نوقم دەبێ. زۆر جێگای پێکەنینە کەسێك لە حەوزی دەڵەمەی لیمۆدا نوقوم ببێ؟

دوو مەسەلەی دیکە باس و وتووێژی لەسەر کرا:

١ـ لە خانوویەکی هەشت گۆشدا ژوورەکانمان بە چ شێوەیەك دەردێن؟

برێك لە کچەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ژوورەکان چوارگۆش دەبن بەلاّم من پێم وایە بە شێوەی "ئاناخامەیی"یان دەبێ. تۆ پێت چۆنە؟

٢ـ وای دابنێین گۆیەکی گەورەی نێوبەتاڵ لە ئاوێنە سازکرابێ و تۆ لە نێویدا دابنیشی، لە کام نوختەدا رەنگدانەوەی روخسارت تەواو رێکوپێك دەردەکەوێ و لەکوێدا ئالۆزو شێواو دەبێ.

دەبینی کاتی بێکاریمان بە چ چەشنە بەناو فەلسەفەیەك رادەبوێرین؟

راستی لەبارەی هەڵبژاردنەوە هیچم بۆ نەنووسیوی. سێ حەوتوو لەوەپێش هەڵبژاردنمان هەبوو. بەلاّم ژیانی ئێمە لێرە بە رادەیەك خێرا لێمان رادەبرێ کە

سێ حەوتوو لەمەوپێش دەڵێی دەورانی دێرینە.

هەرچۆنێك بێ "سالی" وەك "ئەرشەد" هەڵبژێردراو لە ڕێوڕەسمی لالەبەدەستان لەگەڵ دروشمی وەك "بژی ماك براید"، لەگەڵ دەستەی موزیك کە بریتی بوو لە سێساز، لەوانەی کە بەدەم لێ دەدرێن (ساز دەهەنی)و یازدە شانە بەڕێوە چوو. ئێستا منو "جولیا" شانازی بەوەوە دەکەین کە لەگەڵ "ئەرشەد"ی کەلاسەکەمان هاومالێن. بەڵێ ... لە بالەخانەی ٢٥٨دا چەند کەسایەتییەکی گرینگی وەك "جولیا"، منو "سالی" دەژین. ئەمە شانازیەکی گەورەیە کە پێمان براوە.

لەگەڵ ڕێزو ئیحترام

جوودیی تۆ

## ١٢ی نوامبر

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

دوێنێ ئێمە، سالی یەکەمان لە یاری "باسکێتبال"دا شکست دا. دیارە لە کارەکەمان زۆر رازین. بەلام چەند خۆش دەبوو ئەگەر بمانتوانیبا سالی سێیەمەکانیش شکست بدەین. من ئامادە بووم هەموو گیانم رەش و شین بێتەوە و یەک حەوتوو لە نێو جێگادا بکەوم و تەواوی لەشم "کومپریسی" بکەن، بەو شەرتە ئەو شانازیەمان دەست بکەوێ.

"سالی" داوای لێ کردووم بۆ پشووی کریسمەس، لەگەڵ ئەوبم. بنەماڵەی ئەو لە "وەرستر"ی "ماساچوسیت" دەژین. نازانی چەند بە خۆشەویستییەوە لەگەڵم دوا؟ زۆرم پێ خۆشە بچم. بە درێژایی تەمەنم لەنێو بنەماڵەیەکدا نەبووم بێجگە لە "سمپل"ەکان. بەلام ئەوان پیرن و زۆر بە حیساب نایەن، بەلام بنەماڵەی "ماک براید" پڕە لە منداڵ (لانیکەم دوو سێ منداڵیان هەیە). باببێک، دایکێک، دایە گەورە و پشیلەیەکی "ئەنقرە"، یانی بنەماڵەیەکی تەواون. چەند خۆشە جانتاکەت هەلگری و بۆ پشووی کریسمەس بچی بۆ ئەوێ. نەک ئەوە کە لە زانکۆدا بمێنیەوە. ئەگەر ئەوەم بۆ رێك بکەوێ لە خۆشیان دیق دەکەم.

زەنگی حەوتەمە و دەبێ بڕۆم بۆ تەمرین. من لە شانۆگەریی "شوکرانە بژێری"دا یاری دەکەم. لە دەوری شازادەیەکدا، بە نیوتەنەیەکی مەخمەرین و قژێکی ئالقە ئالقە و لوولەوە.

ئیرادەتمەند

ج - ئـ

شەممە

پێت خۆشە بزانی سیماو روخساری من چۆنەو لە چی دەچم؟ وێنەیەکی سێ کەسی: "سالی"، جولیا"و من کە "لیونورا" گرتوویەتی بۆت دەنێرم. ئەو قژبۆرەی کە پێ دەکەنێ، "سالی"یەو ئەو کەڵەگەتەی کە بە غـرووررەوە وەستاوە "جولیا"یەو ئەو بچکۆلەی کە "با" قژەکانی رژانوەتە روحساری "جوودی"یە بەڵام "جوودی" خۆی جوانترە لە وێنەکەی. لەم وێنەیەدا چاوی لەبەر خۆر هەڵناوە.

ج - ئـ



وێنەی سێ کچەکە

"دەروازە بەردین"

ووستر، ماساچۆسێت

٣١ی دیسامبر

بابە لاق درێژی ئازیزم

دەمویست زۆر زووتر لە ئێستا نامەت بۆ بنووسم‌و لەسورخی چەکێکەوە کە بۆ جێژنانە ناردبووت سپاست لێ بکەم بەڵام ژیان لە ماڵی "سالی" مرۆڤ زۆر بە خۆیەوە خەریک دەکا، بە جۆرێك کە تەنانەت کاتی ئەوەم نیە چەند خولەك دابنیشم‌و نامە بنووسم.

من قاتێك جلی نوێم کڕیوە. نیازێکی واشم پێی نەبوو بەڵام پێم خۆش بوو بیکڕم. ئەوە جێژنانەی ئەمساڵی منە کە بابە لاق درێژ پێی داوم. بنەماڵەم تەنیا سڵاوو پیرۆزبایی‌یان ناردووە. من لە پشووی ئەمساڵدا لەگەڵ "سالی" زۆرم خۆش لێ رادەبرێ.

ماڵەکەیان لە خشتی سووری قەدیمییە. پەراوێزی خشتەکان بە رەنگی سپی رازاوەتەوەو کەمێك لە شەقام دوورە راست وەك ئەو خانوانەیە کە کاتێك لە هەتیوخانە بووم بە حەسرەتەوە تماشام دەکردن‌و نەمدەزانی چییان لەنێو دایەو چ جۆرێکن. ئەو کاتە هەرگیز بەهیوا نەبووم ناوەوەی خانوویەکی ئاوەها ببینم، بەڵام سەرەنجام بە ئاواتی خۆم گەیشتم.

هەموو شتێك رێك‌و پێك‌و خاوێنەو باشترین شوێنە بۆ پەروەردەی منداڵ. سووچ‌و قوژبنە تاریکەکانی بابەتی چاوشارێکێن. کوانوەکان چاکترین جێگان بۆ

گەنمەشامی برژاندن. لەو ڕۆژانەشدا کە باران دەباری ژووری ژێر هەیوان بۆ یاری کردنو پەیژە خزەکانیش بۆ خلیسکێن زۆر باشن.

چێشتخانەی ماڵ گەورەو روو بە ڕۆژە. چێشتکەرێکی خرپنو خوێنشیرینیان هەیە کە ١٣ ساڵە کاریان بۆ دەکا. هەموو ڕۆژێك کێکێك درووست دەکاو بەشێکی دەشارێتەوە بۆ منداڵەکان.

بێینە سەر باسی ئەندامانی بنەماڵە. جێی بڕوا نیە بنەماڵەیەك ئەوەندە لەگەڵ یەك میهرەبانو تەبا بن. "سالی"، دایك، باب، دایەگەورەو منداڵێکی زۆر جوانی قژلوول، برایەکی لەبەر دڵانیشی هەیە کە هەموو کات لەبیری دەچێ پێش ئەوەی بێتە ژوورەکان پێڵاوەکانی خاوێن بکاتەوە. برایەکی گەورەشی هەیە، کەڵەگەتو جوان چاك کە ناوی "جیمی"یەو لە زانکۆی "پرسینستون" دەرس دەخوێنێ.

لەسەر مێزی ناغواردن زۆر خۆشمان لێ ڕادەبرێ. هەموو لەگەڵ یەك قسە دەکەنو پێدەکەنن. پێش نان خواردن هیچکەس دوعا ناخوێنێ. ئەمە خۆی نیعمەتێکی باشە کە مرۆڤ ناچار نەبێ بۆ هەر پاروە نانێك شوکرانەبژێر بێ (لەوانەیە من کافر بم، بەڵام ئەگەر تۆش بە درێژای تەمەن بۆ شوکرانەبژێری ناچاریان دەکردی، ئەو کاتە تۆش کافر دەبووی).

نازانم لە کوێوە باسی ئەو کارانە دەست پێ بکەم کە لەم ماوەیەدا ئەنجامم داون. بەڕێز "ماك براین" خاوەنی کارگەیەکە کە لە لایەن ئەو کارگەیەوە بۆ شەوی جێژن دارێکی "نوئیل"ی بۆ منداڵانی کرێکارەکان درووست کراوە. ژووری گەورەی تایبەت بە بەستە پێچانەوەی جێژنانەکان بە گەڵای سەوز رازابۆوە. "جیمی مەك براین" جلوبەرگی بابە "نوئیل"ی لەبەر کردبوو. منو "سالی" پێکەوە جێژنانەکانمان دابەش دەکردن.

بابەگیان! کاتێك لەگەڵ منداڵە بچکۆلەکاندا بەرەورِوو دەبووم هەستێکی سەیرم هەبوو. جاروبار وام هەست دەکرد یەکێك لە یارمەتیدەرانی "جان گریر"م، خێرخوازو لێبوردە. خۆم پێ رانەگیراو یەکێك لە منداڵە جوانەکانم کە هەموو دەموچاوی لە شیرینییەوە پلەکا[1] بوو، بە شەوقەوە ماچ کرد. بەڵام باوەرِ ناکەم بە نیشانەی یارمەتی دەستم لە پشتی کەسێك کەوتبێ. دوو رۆژ پاش کریسمەس بە خاتری من رێورِەسمێکی سەمایان ساز کرد. ئەمە یەکەم جار بوو لە رێورِەسمێکی سەمادا بەشدار بم. سەمای بەرِاستی. سەمای زانکۆ کە کچەکان پێکەوە سەمایان دەکرد قبووڵ نیە. من جلوبەرگێکی نوێی تایبەتی شەوم لەبەر کردبوو کە رەنگی سپی بوو (هەر ئەو جێژنانەی کە تۆ بۆت ناردبووم) پڕ بەم دنیایە سپاست دەکەم. لەگەڵ دەستکێشێکی درێژو پێڵاوی ساتینی سپی. لەم جێژنو میوانیەدا دڵخۆشیی من ئەویە کە خاتوو "لیپت"ی لێ نیە کە بە خێسەوە لێم برِوانێو بزانێ چۆن منو "جیمی" پێکەوە رێورِەسمی سەماکەمان کردەوە. تکات لێ دەکەم هەرکات چوویتە "جان گریر" ئەو شتەی بۆ بگێرِەوە.

بچووکی هەتا هەتاییت

جوودی ئابووت

بابە گیان زۆرت پێ ناخۆش دەبێ ئەگەر من لەباتی ئەوە ببم بە نووسەر، ببم بە کچێکی زۆر ئاسایی؟

---

[1] پلەکان: تێوەچوون، تێوە ساوراو، هەموو جلەکانم پلەکابوون لە قورِەوە

**شەممە ـ کاتژمێر ٩:٣٠**

ئێمە ئەمڕۆ بە پێیان چووین بۆ شار. باران بە توندی دەباری. من زستانم لە بەفرەوە پێ خۆشە نەك بە بارانەوە.

مامی خوێنشیرینی "جولیا" بە بەستەیەك شـکۆلاتی ٥ پۆنـدی‌یەوە هـات. بزانـە هاوماڵ بـوون لەگـەڵ "جولیـا" چـەندە گرینگـە. ئـەم بچـکۆلە هـەتیوە بێ‌دایك‌و بابە بە باشی لە دڵی "پندلتون"دا جێگای خۆی کردۆتەوە. ئەم بەڕێزە، (پنـدلتون) بـۆ ئـەوە لەگـەڵ مـن قـاوە بخواتـەوە سـەفەرەکەی دواخسـت بـۆ شەمەندەفەری دواتر. بەڵام بابە بە زەحمەت ئیزنی ئەوەیان داینێ کە پەزیرایی لێ بکەین. لێرە میوانداری لە بابە گەورەش زەحمەتە تا بگا بە مـام. میوانـداری لـە براو کوڕە مام لە کارە محاڵەکانە.

"جولیا" ناچار بوو لـە بەرابـەر کەسایەتییەکی زانکـۆدا سـوێند بخوا کـە جەنابی "پندلتون" مـامی ئەوەو ئامادە بوو لەو بارەوە بە نووسراوەی ئیمزا کراو بە شێوەی فەرمی بە مەسەلەکە کۆتایی بێنێ (دەبینی زانیاریی دادوەریـم تـا چ رادەیەك زیادی کردووە). لەگەڵ هەموو ئەوانەش ئەگەر سەرۆکی زانکـۆ دەیزانـی مـامی "جولیـا" ئەوەنـدە گـەنج‌و خوێنشـیرینە، لـەو بڕوایـەدا نـیم کارێکمـان لەدەست بهاتبایە.

بەهەرحاڵ ئێمە چایی، بابۆڵە بە نانی رەش‌و پەنیری "سویسـی"مان خـوارد. بەڕێز "پندلتون" لە سازکردنی بابۆڵە یارمەتیی دام‌و خۆی چواردانەی خـوارد. من پێم گوت کە هـاوینی رابوردوو لـە "لاك ویلـو" بـووم‌و مـاوەیـەك لـەبارەی خـاتوو "سمپل"ـەوە قسـەمان کـرد. پاشـان قسـە هاتـە سـەر ئەسـپ‌و گـاو

جووجەڵەکان. ئەو ئەسپانەی ئەوکاتە کە "پندلتون" بە منداڵی لەوێ بووە هەموویان مردبوون. بێجگە لە یەکێکیان بەنێوی "گرور" کە لەو کاتانەدا نۆما[1] بووەو ئێستا ئەوەندە پیرە کە شەلە شەل ڕێ دەکاو لە لەوەڕگەکەدا بەرەڵڵا کراوە.

"پندلتون" لێی پرسیم داخوا ئێستاش نانە چەورە لە دەفرێکی گڵینی زەرددا کە وەك دەوری دەچێ، لە ژووری هەیواندا دادەنێن یان شوێنەکەیان گۆڕیزاوەتەوە؟ هەروا دەیپرسی: لە لەوەڕگە لەژێر گاشە بەردەکاندا هێلانە کۆترەکان هەر ماون؟ لە وەڵامدا گوتم "ئاماسی" ڕۆژێکیان یەکێك لە کۆترە قەڵەوەکانی گرت. پێم وایە ئەو کۆترە نەوەی بیستو پێنجەمی کۆترێك بێ کە بەڕێز جروی لەکاتی منداڵیدا یاریی پێ کردووە.

من کاتی قسەکردن ناوی بەڕێز "پندلتون"م بە بەڕێز "جروی" (واتە ناوە بچکۆلەکەی) دەهێنا. پێم وا نیە ئەو کارەی منی پێ ناخۆش بووبێ.

"جولیا" دەیگوت قەت مامم ئەوەندە خۆشحاڵ نەدیتووە. چونکە ناکرێ هەروا بە سانایی لەگەڵ بەڕێز "پندلتون" نێزیك ببیەوە. دیارە "جولیا" بۆ پەیوەندی گرتن زۆر لێزان نیە. بۆ نزیکایەتیو تەبایی لەگەڵ پیاوان سیاسەتو لێزانی پێویستە. ئەگەر "دەماری خەو"ی پیاوان بدۆزیەوە، وەك پشیلە هێدیو ئارامنو ئەگەر بە پێچەوانەی ئارەزوویان بجوولێیتەوە چنگوڕك دەگرن.

ئێمە سەربردەی "ماری باشکرت سیف"[2] دەخوێنینەوە. چیرۆکێکی سەیرە. گوێ ڕاگرە بۆ ئەم بەشەی: "دوێنێ شەو بە جۆرێك تووشی بێهیوایی ببووم، کە

---

[1] نۆما: جوانوو

[2] Mari Bashkirt Seff

بێ ئیختیار هاوارم لێ بەرز بۆوەو سەرەنجام کاتژمێری هۆڵی ناخواردنم هەڵگرت‌و فڕێمدا نێو دەریاوە".

بابەگیان ئەگەر بلیمەت بوون مرۆڤ تووشی ئاوا رۆژێك دەکا، هیوادارم هەرگیز نەبمە بلیمەت. خوایە هاوار باران وەك لافاو دەباریَ. پێم وایە ئەمشەو دەبێ بە سەلە بچین بۆ کلیسا.

جودیی هەردەمی تۆ

## ٢٠ی ژانوویە

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

تۆ کچۆڵەیەکی ژیکەڵانەت نەبووە کە بە منداڵی لێیان دزیبی؟ نەکا من ئەو کچە بم! ئەگەر ئێمە پاڵەوانی چیرۆکێك بووباین، دۆزینەوەی ئەوە کە من ئەو کچەی تۆم کردنەوەی گرێی ئەو معەمایەی ئاسان دەکرد.

زۆر جێگای تیتاڵییە کە مرۆڤ نەزانێ کێیە. باسەکە زۆر سەرسووڕهێنەرو شاعیرانەیە. زۆر شیمانە لەم نێوەدا هەیە. لەوانەیە من ئامریکایی بم. لەوانەیە باو باپیرانی من "رۆمی" بن یان کچی یەکێك لە دزە دەریاییەکان بم. یان ئەوە کە بابم یەکێك لە "رووسە" دوور خراوەکان بووبێو جێگای من گرتووخانەکانی "سیبریا" بووبێ. زیاتر لەوە دەچێ کە من کچە کاوڵی بم. چونکە کردارو ئاکارمو هەروەها ئاوارەیی‌و سەرگەردانیم زۆر لەو کاولییانە دەچێ، کە یەشتا هەلی گەشەکردنی تەواویان بۆ نەرەخساوە.

نازانم لەبارەی ئەو ریسوایەوە کە لە "جان گریر" پێکم هێنا شتێکت بیستووە؟

من لە هەتیوخانە هەڵاتم چونکە نان شیرینیم دزیبوو ئەوان منیان سزا دا. چۆنیەتیی ئەو رووداوە بە درێژی لە دەفتەرێکی تایبەتیدا نووسراوەو هەر یارمەتیدەرێکی هەتیوخانە دەتوانێ بیخوێنێتەوە. بەڵام بابەگیان بەخوات سوێند دەدەم لە کچێکی تەمەن نۆ ساڵی هەتیوی برسی کە بۆ خاوێنکردنەوەی چەقۆکان ناردرابێتە چێشتخانەو لە پەنادەستیدا دەفرێکی پڕ لە نان شیرینی

دانرابێ، دەبێ چ چاوەڕوانییەکت هەبێ؟

ئەگەر لە پڕێکدا بێن بەسەردا ببینن کە سەرتاپای پلەکاوە لە وردە نان‌و شیرینییەوەو پاشان پەلی بە قەڵسی بگرن، بیدەنە بەر زللە، لەسەر مێزی نان خواردن هەڵیسێنن‌و بڵێن چونکە دزیی کردووە نابێ نان بخوا، حەقم بدەرێ ئەگەر تۆ لەجێی من بای هەڵنەدەهاتی؟

من تەنیا چوار میل دوور کەوتبوومەوە کە گەڕانمیانەوە بۆ هەتیوخانەو تا یەك حەوتوو کاتی پشووی منداڵەکان منیان بە کۆڵەکەیەکەوە دەبەستەوە. ئەی هاوار زەنگی کلیسایان لێدا. پاش کلیسا دەبێ لە کۆبوونەوەی کۆمیتەیەك بەشداری بکەم. بابە! لێم ببوورە دەمویست نامەیەکی سەرنج راکێشت بۆ بنووسم.

ئەف ویدر زن[1] بابی خۆشەویستم

پەراوێز:

من هەرچی بم ئەوە جێگای گومان نی کە چینی نیم.

---

[1] auf wiedershn بە زمانی ئاڵمانی واتە خوات لەگەڵ

٤ی نوریە

بابە لاق درێژی خۆشەویست

"جیمی ماك براید"ی برای "سالی" هاوڕێم ئالآیەكی "پرینستون"ی بۆ ناردووم كە سەرانسەری دیواری ژوورەكە دادەپۆشێ. لەوەی كە لەبیری نەكردووم سپاسی دەكەم. بەڵام هەرچەند بیری لێ دەكەمەوە نازانم ئەم ئالآیە بە چ كارێكی من دێ؟ "سالی"و "جولیا" ناهێڵن دایكوتم بە دیوارەكەدا. كەلوپەلی ژوورەكەمان ئەمساڵ بە ڕەنگی سوورە. چەندە سەرنج ڕاكێش دەبوو ئەگەر نارنجی‌و ڕەش لە ڕەنگی سوور زیاد كرابا. بەڵام قوماشی ئەم ئالآیە وەكوو لباد، یان ماوەتە، زۆر گەرمە. حەیفم لێ دێ خراپی بكەم. ڕەنگە باشتر ئەوە بێ كە خاولییەكی حەمامی لێ درووست بكەم. خاولیی حەمامەكەم چووەتە ئاوو زۆر كورت‌و تەنگ بۆتەوە.

لەم دواییانەدا لەبارەی وانەكانمەوە هیچم بۆ نەنووسیوی. هەرچەند لە نامەكانمدا نەمنووسیوە، بەڵام بێ‌پسانەوە وانەكانم دەخوێنم. زۆر گرانە مرۆڤ لە یەك كاتدا پێنج مادە فێر بێ.

مامۆستای شیمی دەڵێ خوێندكاری باش ئەوەیە كە وردەكارییەكانی دەرسەكەی بە باشی بخوێنێ، بەڵام مامۆستای مێژووەكەمان دەڵێ ئاگادار بە بە خوێندنەوەی وردەكارییەكان مێشكی خۆت ماندوو نەكەی. هەر ئەوەندە بخوێنەوە كە مادە گشتییەكان فێر بی.

باشە بابە گیان! ئەگەر تۆ لەجیاتی من بای چۆنت دەتوانی هەر دوو

مامۆستاکە رازی بکەی. هەرچۆنێك بێ من بۆچوونی مامۆستای مێژووم لا پەسەندە. ئەگەر من بڵێم "ویلیامی فاتیح"[1] لە ساڵی ١٤٩٢دا هات، یان ئەوەی کە کریستۆف کلۆمپ لە ساڵی ١١٠٠ یان ١٠٦٦ یان نازانم لە کام مێژوودا ئەمریکای دۆزیەوە، ئەمە درێژەپێدانێکی زیادییە کە مامۆستاسەرنجێکی ئەوتۆی ناداتێ. کاتی وانەی مێژوو، مرۆڤ هەست بە ئاسایشو ئارامییەك دەکا، بەڵام لە کەلاسی وانەی شیمی دا بەو شێوەیە نیە. زەنگی شەشەم لێ درا. دەبێ بچینە ئەزمونگەو لەبارەی "ئەملاح"ی ئەسیدییەوە باسو لێکۆڵینەوە بکەین. پێشی بەروانکەی ئەزموونگەکەم بە ئەسیدی کلودریگ سووتاوەو کونێکی تێبووە بە ئەندازەی دەورییەك دەبێ. ئەگەر گریمانە شیمیاییەکان راست بێ دەبێ بە لێکدراو (محلول)ی "ئامونیاکی بەهێز شوێنەوارێك لەو کونە نەهێڵمەوە. مەگەر وا نیە؟

حەوتووی داهاتوو تاقی کردنەوە دەست پێ دەکا ـ کێ دەترسێ؟

---

[1] ویلیامی فاتیح پادشای ئینگلیسی

**٥ی مارس**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

بایەکی بەهێز هەڵیکردووە پەڵە هەوری ڕەش لە ئاسماندا لە گەڕاندان. قاڵاوی سەر دارەکان قاڕە قاڕیانە. دەوروبەر لە جۆش و خرۆشدایەو مرۆڤ بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێ. پیاو پێی خۆشە کتێبەکانی دابنێ و بەرەو تەپۆڵکەکان هەڵێ و لەگەڵ "با" کێبەرکێ بکا. شەممەی ڕابووردوو چاوشارکێمان دەکرد. مـن وا دەزانم ئێمـە براوە بووین، تۆش پێت وا نیە؟

کاتـژمێر ٦:٣٠ گەڕاینـەوە زانکـۆ. نیـو کاتـژمێر لـە کـاتی شـێوخواردن لایدابوو. بۆ ئەوە جلەکانمان بگۆڕین چوینە سەر مێزی نـانخواردن. پاشـانیش بـە بیانووی ناخاوێنیی پێڵاوەکانمانەوە نەچووینە کلیسا.

لەبارەی تاقیکردنەوەکانەوە هیچم نەنووسی. من لـە هـەموو وانەکانـدا نمـرەم هێناوە. ئێستا شێوازی کارەکان بە باشی شارەزام، هـەرگیز ڕەت نابـەوە. ئەگـەر چی پێموایە بەهۆی ئەوەوە لە ساڵی یەکەمدا لە وانەی لاتین و ئەنـدازیاریدا ڕەت بوومەوە، وا نازانم بە نمرەی بەرزەوە دەرچم. زۆر گرینگ نیە؟

تۆ تا ئێستا "هاملێت"[1]ت خوێندووەتەوە؟ ئەگر نەتخوێندووەتەوە هەر ئێسـتا دەستی پێ بکە. شتێکی زۆر بەرزە. تەمەنێك پەسنی شکسـپیرم بیسـتبوو بـەڵام قەت وام نەدەزانی نووسراوەکانی ئەوەنـدە بـەرز بـن. پێموابـوو ئـەوەی دەیبیسـتم

[1] هاملێت دراما بەناوبانگەکەی هاملێت شازادەی دانمارکییە. ئۆفیلیا دەزگیرانی بوو

تەنیا پەسن و پێدا هەڵگوتنە.

هەر لە یەکەم ڕۆژەکانەوە کە خوێندنەوەو نووسین فێر بووم لاسایی شانۆگەرانم دەکردەوە. مەبەستم ئەوەیە هەر کتێبێکم بخوێندایەتەوە، کاتێک دەمویست بنووم، لای خۆم وام دادەنا کە پاڵەوانی چیرۆکەکەم. ئێستا من "ئۆفیلیا"م ئەویش چ ئۆفیلیایەک. هەردەم هاملێت سەرگەرم دەکەم. بە دەوروپشتیدا دێم. شەڕی لەگەڵ دەکەم. هەرکات هەڵامەت بگرێ ناچاری دەکەم ملپێچی هەبێ. من ناساخییە خەیاڵاتییەکەی ئەوم دەرمان کرد. پادشاو شاژن هەردوویان لە کارەساتێکی دەریاییدا مردوون. ئیدی نیازێک بە ڕێوڕەسمی بەخاک سپاردن نەبوو. ئێستا منو هاملێت بێ دەردیسەر دەسەڵاتداری دانمارکین. لە دەسەڵاتداریی ئێمەدا دانمارک بە باشی بەڕێوە دەچێ. هاملێت بە کاروباری وڵاتدا رادەگاو منیش کاری خێرەومەندانە دەکەم. لەم ڕۆژانەدا دایەنگەیەکی زۆر باشم بۆ منداڵانی هەتیو درووست کردووە. ئەگەر تۆ یان هەر خێرەومەندێکی دیکە ویستیان سەرێ لێ بدەن. من بەو پەڕی پێخۆشبوونەوە لەگەڵتان دەبم. لەگەڵ ڕێزم.

ئۆفیلیا، شاژنی دانمارک

**٢٤ی مارس**

**(لەوانەشە ٢٥یش بێ)**

**بابە لاق درێژی خۆشەویست**

**پێم وایە پێویست ناکا بچمە بەهەشت. لێرە ئەوەندە شتی باش هەن کە ناکرێ ئەوانە بەجێ بێلم‌و روو لە بەهەشت بکەم.**

**سەرنج بدە بۆت باس کەم.**

**لە کێبەرکێی کورتە چیرۆکدا کە هەموو ساڵێك گۆڤاری مانگانەی زانکۆ سازی دەکا "جیرۆشا ئابۆت" سەرکەوتنی بەدەست هێنا (٢٥ دۆلار خەڵات کرا) واتە خوێندکارێکی ساڵی دووەم! بەپێی عادەت زۆرتر خوێندکارانی ساڵی کۆتایی زانکۆ براوە دەبن. کاتێك ناوی خۆم لە ریزبەنددا بینی باوەڕم نەدەکرد. تۆ بڵێی بەڕاستی بوومە نووسەر؟ خۆزیا خاتوو "لیپت" ئەو ناوە دزێوەی لەسەرم دانەنابا. هەروەها لە شانۆگەریەکاندا کە وەرزی بەهار بەڕێوەی دەبەن بەشدارم. لە شانۆگەریی "هەرچۆنت پێخۆشە"دا دەوری "سلیا" کچی پووری "رۆزالیند"دا یاری دەکەم.**

**هەواڵێکی دیکە ئەوەیە کە هەینی داهاتوو من‌و "جولیا"و "سالی" دەچین بۆ نیویورك بۆ کڕینی شتومەکی بەهاری. شەو لەوێ دەمێنینەوەو رۆژی دوایی لەگەڵ بەڕێز "جروی" دەچین بۆ تیناتر. بەڕێز "جروی" دەعوەتی کردووین. "جولیا" شەو لە ماڵی خۆیان دەبێ‌و من‌و "سالی"ش لە هوتێلی "ماراتا واشینگتۆن" دەبین.**

من تا ئێستا نە هوتێل چووم‌و نە تیناترم دیوە تەنیا جارێك چوومە تیئـاتر، ئـەویش لــە جێــژنی کلیســـای "کاتولیــك"دا بــوو. ئـەوکات منداڵــەکانی هەتیوخانەیان کۆکردبۆوە کە بیانبەن بۆ ئەوێ. دیـارە نـاکرێ ئەوە بـە تیئـاترو شانۆگەری دابنرێ. بـڕوا بکـەی یـان نـا شـانۆگەرییـەك کـە دەچـین شـانۆگەریی "هاملیت"ــە. بـیری لێ بکـەوە، چـوار حـەوتوو لەمـە پـێش ئـەو شـانۆگەرییـەم خوێندوەتەوەو وشە بە وشەیم لەبەر کردووە. لەو ڕووداوانـەی کـە بـۆم دێنـە پـێش ئەوەندە شادم کە بە گران خەوم لێ دەکەوێ.

خوات لەگەڵ

ئەم جیهانە باش مرۆڤ سەرگرم دەکا

بچووکی هەردەمی تۆ ـ جوودی

پاشکۆی نامە:

هەر ئێستا چاوم لە ساڵ ئەژمێر کرد

٢٨ی مانگی مارسە

پەراوێزێکی دیکە:

ئەمڕۆ شۆفیرێکم بینی چاوێکی شین‌و چاوەکەی دیکەی قاوەیی بـوو. پێـت وا نیە ئەوە بۆ نووسینی چیرۆکێکی پولیسی زۆر باش بێ؟

## ٧ی ئاوریل

## بابە لاق درێژ

پەنا بەخوا! نیویورك چەندە گەورەیە. "وورسیتر" لە بەرامبەریدا هیچ نانوێنێ. ئەرێ بەڕاستی تۆ چۆن لەم شلوقیو بێنەو بەردەدا دەژیت. پێم وایە دوو مانگێکی دەوێ لە حەبەسانو کاریگەرییەك کە ئەم شارە لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا لەسەری داناوم ئاسوودە بم.

نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەمو ئەو شتە سەیرانەی ئێرەت چۆن بۆ بەیان بکەم. دیارە چونکە خۆت لێرە دەژیی، ئاگات لە هەموو شتێك هەیە شەقامەکان چەندە گەورەو جوانن. خەڵکەکەی، دووکانەکان!! من تا ئێستا ئەم هەموو شتە سەرنجڕاکێشەی کە لە دووکانەکانی نیویورکدا دیتوومە لە هیچ جێگایەکی دیکە نەمدیوە. مرۆڤ حەز دەکا هەموو تەمەنی تەرحان بکا بۆ لەبەرکردنی ئەم گشتە جلوبەرگە جوانە. بەیانیی ڕۆژی شەممە منو "جولیا"و "سالی" چوین بۆ کڕینی شتومەك. "جولیا" چووە دووکانێکی گەورەی وەها کە مرۆڤ لە دیتنی سەرسام دەبوو. دیوارەکانی سپیو تەلایی. تەختی دووکانەکە بە مافوورەی شین فەرش کرابوو. پەردەکان ئاوریشمینو کورسیەکان بە ڕەنگی تەلایی بوون.

خاتوونێکی زۆر جوانی قژ تەلایی کە جلوبەرگی ڕەشی لەبەر کردبوو بە زەردە خەنەیەکی شیرینەوە بەرەورووومان هات. من لە پێشدا پێموابوو "جولیا" بۆ دیدار لەگەڵ ئەم ژنە هاتووە بۆیە تەوقەم لەگەڵ کرد. پاشان دەرکەوت کە

"جولیا" بۆ کڕینی کڵاو هاتۆته ئەم دووکانە. "جولیا" لەسەر کورسییەك لە بەرامبەر ئاوێنەدا دانیشتو دە دوازدە کڵاوی لەسەر کردنو تاقیانی کردەوە. یەك لە یەك جوانتر بوون. دوو لە کڵاوەکانی کڕین.

چەند، خۆشە کەسێك لە بەرامبەر ئاوێنەدا دابنیشێ، ئەو کڵاوەی کە پێی جوانە تاقیی بکاتەوە بێ ئەوە نیگەرانی پارەکەی بێ، بیکڕێ.

دوای ئەوە کاری شتومەك کڕینمان کۆتایی پێ هات، بەپێی بەڵێنێك کە بە بەڕێز "پندلتون"مان دابوو، چووین بۆ ریستورانی "شریز"و ئەومان لەوێ بینی. بێگومان تۆ ریستورانی "شریز"ت دیوە. ئەم ریستورانە لەگەڵ هۆڵی نانخواردنی "جان گریر" بەراورد بکە، بەو روومێزە مشەمایی‌و دەفری گلێنەو کاردو چنگاڵە دەستك دارینانەیەوە. ئەمجار بیر بکەوە کە من لە چ حاڵێکدا بووم.

من ماسیم بە چنگاڵێك خوارد کە تایبەتی ئەو کارە نەبوو. بێ ئەوە کەس تێبگا خزمەتکار چنگاڵی ماسی خواردنی دا بە دەستمەوە.

پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ چووین بۆ تیئاتر. بابە ... بابە جێگای باوەڕ نیە. بێ هاوتایە سەرسووڕهێنەرە. هەموو شەوێك خەوی پێوە دەبینم. ئایا شکسپیر بلیمەت نیە؟

"هاملیت"یك هاتە سەر شانۆ. زۆر باشتر بوو لەو هاملێتەی کە ئێمە لە زانکۆ لە بارەیەوە دەدواین‌و پێشتر من خۆشم لێی دەهات، بەڵام ئێستا ... خوایە چی بڵێم.

ئەگەر تۆ رێگام پێ بدەی وام پێ باشە لەباتی نووسەر ببمە هونەرمەند. پێت خۆش نیە ئەم زانکۆیە بەجێ بێڵم‌و بڕۆمە زانکۆی شانۆگەری؟

ئەگەر وابێ هەموو کات "لۆژ"[1]یکی تایبەت بۆ تۆ دیاری دەکەم کە نمایشەکانی من ببینیو منیش لەسەر سەکۆی شانۆوە بەرەورووت پێدەکەنم. بەڵام تکات لێ دەکەم تۆش گوڵێکی سوور بدە لە بەرۆکت بۆ ئەوەی زووتر بتناسمەوەو زەردەخەنەکەم بۆ کەسێکی دیکە نەبێ. ئەگەر شتێکی وا روو بدا پێم ناخۆش دەبێ.

ئێمە شەوی یەکشەممە گەڕاینەوەو ژەمی شێومان لە نێو شەمەندەفەردا خوارد. مێزی شەمەندەفەر بە چرای چێرەیی رازابۆوەو خزمەتکاری رەش پێست پەزیراییان لە مسافرەکان دەکرد. من نەمبیستبوو کە لە شەمەندەفەردا شێویش دەدەن. بێخەیاڵ ئەوەم بە دەمدا هات. لەپڕ "جولیا" گوتی:

ـ بۆچی تۆ لە کوێ گەورە بووی؟

ـ بە ترێقییەوە گوتم:

لە گوندێکدا

ـ بۆچی تا ئێستا سەفەرت نەکردووە؟

ـ نا تا ئەو رۆژەی هاتوومە زانکۆ سەفەرم نەکردووە. مەودای ئەو رێگایەش تا زانکۆ ١٦٥ مایل زیاتر نەبووەو لەو سەفەرەشدا لەنێو شەمەندەفەردا نانمان نەخوارد.

لەوەی کە منو جاروبار بەو شێوەیە دەدوێم، "جولیا" بە وردبینییەوە خۆشەویستی خۆی سەبارەت بە من نیشان دەداو منیش هەوڵ دەدەم ئەو جۆرە قسانە کە دەبنە هۆی ئابڕوو چوونم لە دەمم دەرنەپەڕێ. بەڵام هەرکات شتێکی نوێو سەیر دەبینم، لەبیرم دەچێ کە دەبێ ئاگام لە دەمی خۆم بێ. بەدشانسیشم

[1] لۆژ: شوێنی تایبەت

لەوەدایە هەموو شتەکانم لا سەیرە. ١٨ ساڵ ژیان لە هەتیوخانەی "جان گریر"و پاشان لە نەکاو چوونە جیهانێکی گەورەو ئازاد، دەبێتە هۆی گێژبوونی مرۆڤ. بەڵام وردە وردە بەوە رادێم کە ئەو هەڵانەی رابوردوو دووپات نەکەمەوە. ئێستە کاتێك لەگەڵ کچان هەڵسوکەوت دەکەم، جارز نابم.

جاران ئەگەر کەسێك لێم ورد دەبوەوە، دەستو پێی خۆم ون دەکردو وام هەست دەکرد کە هەموان وا دەزانن ئەم جلوبەرگە نوێیانە هی من نیەو من هەر ئەو کچە هەتیوە رووپۆش لەبەرەی فێرگەم. بەڵام ئێستا ئەو جۆرە بیرکردنەوانە نیگەرانم ناکەن.

لەبیرم چوو لەبارەی گوڵەکانەوە بۆت بنووسم. بەرێز "جروی" بە هەر یەك لە ئێمە دەستە گوڵێکی سوێسنەو وەنەوشەی داینێ. مرۆڤێکی زۆر میهرەبانە. ئەوانەی ئا ئێستا دیومن کەسانی یارمەتیدەر بوون‌و قەت خۆشم نەدەویستن. بەڵام بۆچوونم دەیەوێ گۆرانی بەسەردا بێ. ئەی هاوار! یازدە لاپەرەم رەش کردۆتەوە. مەترسە هەر ئێستا کۆتایی پێ دێنم.

جوودیی هەمیشەیی تۆ

دەیەمی ئاپریل

جەنابی سامانداری خۆشەویست

چەکە ٥٠ دۆلارییەکەتم بۆ ناردیەوە. زۆر سپاس بۆ ئەو هەموو میهرەبانییەت. بەڵام ناتوانم پارەکە قبووڵ بکەم. پارەی مانگانەکەم بەشی ئەوە دەکا کڵاوی پێ بکڕم. زۆر بە داخەوەم کە لەبارەی ئەو کڵاوفرۆشییەوە بۆم نووسیبووی لەوە پێش دووکانی وام نەدیبوو.

لە هەرحاڵدا مەبەستی من لەو شتە دەرووزەکردن نەبوو. وام پێ باشترە زیاتر لەوەی کە نیازم پێیەتی یارمەتی قبووڵ بکەم.

بچووکی تۆ

"جیرۆشا ئابۆت"

**١١ی ئاپریل**

**بابەی زۆر خۆشەویستم**

دەکرێ بۆ ئەو نامەی کە دوێنێ نووسیم داوای لێبوردنت لێ بکەم؟

دوای ئەوەی نامەکەم دا بە پۆست پەشیمان بوومەوەو هەولّم دا لە پۆستخانەی وەریبگرمەوە، بەلاّم کارمەندی پۆستخانە کابرایەکی بێڕەزا بوو، نامەکەی نەدامەوە. ئێستا نیوە شەوە، من هێشتا نەنووستووم. وا بیر دەکەمەوە کە دەعبایەکی خراپم. دەرکی ژوورەکەم بە ئاستەم پێوە دا کە "جولیا"و "سالی" خەبەریان نەبێتەوە. لەنێو قەرەوێڵەکەمدا دانیشتووم‌و گەلاّیەك کاغەزم لە دەفتەری مێژووەکەم لێ کردۆتەوە، دەمەوێ نامەت بۆ بنووسم.

تەنیا شتێك کە دەمەوێ بیڵێم داوای لێبوردنە. لەبارەی ئەو چەکەوە کە بۆت ناردبووم زۆرم بێ‌ئەدەبی کرد. دەزانم تۆ بێجگە لە خۆشەویستی مەبەستێکی دیکەت نەبووە. تۆ بابەی پیرو لەبەر دڵانی منی‌و بۆ ئەو کلاّوەی کە من زۆرم پێ جوان بوو زەحمەتت بە خۆت داوە. من دەبیا چەکەکەم بەرێزو پێزانینێکی زیاترەوە بناردایەتەوە. بەلاّم هەرچۆنێك بێ دەبوو بە جۆرێك بینێرمەوە. لە قەدەر کچەکانی دیکە من هەلومەرجێکی تایبەتیم هەیە. ئەوان زۆر سانا دەتوانن دیاری وەربگرن. ئەوان خوشك، برا، باب، مام‌و پووریان هەیە. بەلاّم من لەو کسانە بێبەشم. دەمەوێ خۆم بەوە رازی بکەم کە تۆم هەیەو بەو خەیاڵە دڵم خۆش بێ. بەلاّم راستی‌یەکان ئەوە نین‌و راستی ئەوەیە کە من تەنیام. دەبێ بە تاقی تەنیا بەرەورووی ئاستەنگەکان ببمەوە. هەرکات لەوە بیر دەکەمەوە پشتم

دەلەرزێو هەوڵ دەدەم بیری لێ نەکەمەوەو دیسان خۆم بەوە رازی بکەم کە کەسێکم هەیە. بەڵام بابەگیان دەبێ ئەوە بزانی نابێ لەوە زیاتر کە پێویستم پێیەتی پارەم هەبێ. هەرچۆنێك بێ دەمەوێ رۆژێك گەورەیی تۆ قەرەبوو بکەمەوەو ئەو پارانەت بدەمەوە. ئەگەر ببم بە نووسەرێکی بەناوبانگیش، دیسانیش نابێ زۆرت قەرزدار بم. راستەً دڵم بە کڵاوی جوانەوەیە، بەڵام ئەوەش باش نیە کە داهاتووی خۆم بۆ ئەو شتە لە بارمتە دابنێیم. بابەگیان! لەو بێئەدەبیەم خۆش دەبی؟

عادەتی خراپی من ئەوەیە کە هەرچی بە مێشکمدادێ بێ راوەستان دەیهێنمە سەر کاغەز. پاش ئەوەی پۆستی دەکەمو ئیتر دەستم پێی راناگا پەشیمان دەبمەوە. لە هەرحاڵدا هەرکات بینیت کە من سپڵەو کەمفکرم، بزانە مەبستی خراپم نیەو لەم ژیانە ئازادو سەربەخۆیە کە تۆ پێت داوم لە ناخی دڵەوە شوکرانە بژێرم. سەردەمی منداڵیی من سەردەمێکی تاریكو پڕ لە هەژاری بوو. بەڵام ئێستا هەموو خولەکێك لە تەمەنم تژییە لە خۆشیو کامەرانی. بەجۆرێك کە هەست دەکەم پاڵەوانی چیرۆکێکمو ئەم هەموو بەختەوەرییە لە خەوندا دەبینم.

کاتژمێر ٢:٤٥ خولەکی دوای نیوەشەوە من زۆر ئارامو لەسەرەخۆ بە نووکی پێ رێدەکەمو ئەم نامەیەت بۆ پۆست دەکەم کە تۆ دوای نامەی پێشوو، زۆر زوو ئەم نامەیەت بەدەست بگا کە بۆ ماوەیەکی زۆر لەبارەی منەوە خراپ بیر نەکەیتەوە.

شەو باش بابە

ئەو کەسەی کە هەمیشە تۆی خۆش دەوێ

جوودی

**٤ی مای**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

شەممەی رابووردوو رێورەسمی "سان و ڕێژە"مان هەبوو. ڕۆژێکی خۆش بوو. لەپێشدا خوێندکارانی هەموو کەلاسەکان لە حاڵێکدا جلوبەرگی کەتانیی سپیان لەبەر کردبوو بەڕیز ڕۆیشتن. پاشان خوێندکارانی ساڵی ئاخر بە چەتری ژاپۆنیی شین و تەلاییو هەروەها ساڵی سێیەمەکانیش بە ئالای زەرد و سپییەوە کەوتنە رێ. ئێمە فوودانەی بە رەنگی ئەرخەوانیمان بەدەستەوە بوو. لەبەر ئەوەی زۆر جار لە دەستمان بەردەبوون، جێگای سەرنج بوو. ساڵی یەکەمەکان کڵاوی کەسکی گوڵەنگداریان لەسەر کردبوو. دەستەیەك "موزیسێن"یان لە شارەوە هێنابوو کە جلوبەرگی شینیان لەبەر کردبوو. دە کەس لە قەشمەر[1]ەکانی سیرکیشیان هێنابوو کە لە ماوەی سان و ڕێژەکەدا بە ئەداو ئوینە سەیرو سەمەرەکانیان خەڵکەکە سەرگەرم بکەن. "جولیا" جلی پیاوێکی گوندیی لەبەر کردبوو و سمێڵی دانابوو. پارچەیەك قوماشی تۆزتەکاندنی بەدەستەوە بوو. "پاتی موریاتی"[2] (ناوی راستەقینەی پاتریشیایە)، تا ئێستا ناوی وات بیستووە؟ (خاتوو "لیپیت"یش نەیدەتوانی ناوێکی لەوە باشتر هەڵبژێرێ). ئەو کچێکی بالآبەرزی لاوازە لە ڕۆڵی خێزانی "جولیا"دا یاریی دەکرد. کڵاوێکی سەیری

---

[1] قەشمەر: گاڵتەچی، دەلقەك

[2] Patsy moprietty

جێ پێکەنینی لەسەر نابوو بە جۆرێك کە گوێیەکانی دادەپۆشی. هەموو ئەو کاتەی کە ئەوان یارییان دەکرد دەنگی قاقای پێکەنین دەبیسترا. "جولیا" رۆڵی خۆی بە باشترین شێوە بەڕێوە برد. قەت بیرم نەدەکردەوە کە لە بنەماڵەی "پندلتون"ـەکان کەسێك هەبێ بەو رادەیە گیانی گاڵتەجاڕیی تێدا بێ (لەگەڵ دنیایەك داوای لێبووردن لە بەڕێز "جەروی پندلتون"). لە راستیدا ئەو وەك "پندلتون"ێکی راستەقینە بە حیساب ناهێنم، هەروەکوو چۆن تۆ بەو جۆرە یارمەتیدەرانە نازانم.

منو "سالی" بەهۆی ئەوە لە کێبەرکێدا بەشدار بووین، لە شانۆگەرییەکەدا دەورمان نەبوو ... چۆن بیر دەکەیەوە؟ هەردوومان لە چەند بەشێکدا بردمانەوە! لە بازدانی سێبازدا بەشداریمان کردو دۆڕاندمان. بەڵام "سالی" لە بازدانی بە نێزە (پرش با نیزە)دا بردیەوە (حەوت پاو سێ ئینچ). منیش لە هەڵاتنی ٥٠ یاردیی کورتدا براوە بووم بە (ماوەی هەشت چرکە). هەرچەند لە کۆتاییدا هەناسە بڕکێم پێکەوتبوو بەڵام زۆر خۆش بوو. هەموو کەلاسەکە میزەڵانەکانیان دەشەکاندەوەو هاواریان دەکرد:

- جوودی ئابووت وەزعی چۆنە.
- وەزعی باشە...
- کێ وەزعی باشە؟
- جوودی ئابوت وەزعی باشە

منیش بەسەربەرزیو شانازییەوە بەرو خێوەت چووم کە جلەکانم لەبەر کەم. لەپێشدا هەموو لەشیان بە ئەلکول بۆ "هەنوو"[1]م. پاشان لیمۆیەکیان دامێ

---

[1] هەسوون: ماڵشت دان بە کرێك یان ئەلکول یان هەر شتێکی دیکە.

کە بیمـژم. راسـت ئـەو کارانـەی کـە لەگـەڵ پاڵـەوانێك دەیکـەن. ئەگـەر لەبـەر کەلاسەکەش بێ، ئەو سەرکەوتنەم زۆر پێ خـۆش بـوو، چـونکە بڕیـار وایـە هـەر کەلاسێك سەرکەوتنی زیاتر بەدەست بێنێ لە کۆتایی ساڵدا گوڵدانی سـەرکەوتن دەباتـەوە. ئەمسـاڵ خوێنـدکارانی سـاڵی ئـاخر بـە بەدەسـت هێنـانی ٧٠ پـوان گوڵدانیان بڕیە بەر خۆیان.



وێنەی "جوودی" لە کێبەرکێی هەڵاتنی پەنجا مەتر

کۆمیسیۆنی وەرزش بۆ ڕێزگرتن لە سەرکەوتووەکان. میوانییەکی لـە بینـای ژیمناستیك بـەڕێوە بـردو خواردەمـەنیی شـێو بریتـی بـوو لـە قـرژاڵو دێسـێری بەستەنی کە بە شێوەی تۆپی باسکە درووست کرابوو.

من دوێنێ شـەو تـا نزیکـی بـەیانی کتێبـی "جـان ئـەیر"(2)م دەخوێنـدەوە. بەڕاست بابە تۆ شەست ساڵ پێش ئێستات لەبیرە؟ داخـوا خـەڵکی ئـەو ڕۆژگـارە وەك "کتێبی "جان ئەیر" لەگەڵ یەکتر دواون؟ خانمی "بلانس" بە لووتبەرزییەوە

(2) Jane Eyre

بە خزمەتكار دەڵێ: ئەی بێ‌مێشكی بێ‌قیمەت دەمت ببەستەو فەرمانەكانی من جێبەجێ كە. بەڕێز "روچیستر" كە دەیەوێ نێوی ئاسمان ببینێ ئاوا دەڵێ:

- شوێنگەی هەورەكان

بەتایبەت ئەو ژنە شێتەی كە وەك كەمتیار پێ‌دەكەنێ، پەردەی نوستنگە ئاور تێ بەر دەداو جلوبەرگی بووكێنی دەدڕێ. هەمموو ئەمانە دەبێ داستان (ئەفسانە) بێ. لەگەڵ ئەوەش چیرۆكێكی سەرنج راكێشە. تا ئەو جێگایە كە خوێنەر بۆ خوێندنەوەو خوێندنەوەو دیسان خوێندنەوە رادەكێشێ.

من تێناگەم كە كچێكی هەتیو چۆنی توانیوە كتێبێكی وا بنووسێ. ئەویش كچێك كە لە كەنیسە گەورە بووە. لەم "خوشكانی بروتنە"دا كێشەرێك هەیە كە من بۆ لای خۆی رادەكێشێ. نووسراوەكانی ئەوان، ورەی ئەوان، ژیانی ئەوان، ئەو ورە بەرزەیان لە كوێ هێناوە. كاتێك ئەو بەشەی كە پێوەندیی بە ئێش‌و ئازارەكانی "جین"ی بچكۆلەم لەو رێكخراوە خێرخوازی‌یەدا دەخوێندەوە، ئەوەندە قەڵس‌و تووڕە بووم كە هەستام‌و چووم بۆ پیاسە كردن. چونكە بە تەواوی بە هەستەكانی ئەو ئاشنا بووم. كەسێك كە خاتوو "لیپت" بناسێ وەك ئەوەیە كە بەڕێز "براكل هیرمسێت"یشی دەیبێ.

بابە تكات لێ دەكەم لە وتەكانم دلگران مەبە. من نامەوێ بڵێم رێكخراوی "جان گریر"و "لوورد" وەك یەكن. لەوێ خواردەمەنیمان بە رادەی پێویست هەبوو. ئامرازی خاوێنی‌و ئاسایشمان فەراهەم بووو زۆرپایەكی گەورەشمان لە ژێرزەمیندا هەبوو كە هەمموو هەتیوخانەكەی گەرم رادەگرت. بەڵام لێكچوونێكی جەرگبڕ لە نێوان ئەم دوو رێكخراوەدا هەیە. بەو واتایە كە ژیانی ئێمە بە هیچ شێوەیەك گۆڕانی بەسەردا نەدەهات‌و رووداوێكی نوێمان نەدەدی. ئەو شتە ئینسانی بێزار دەكرد. تەنیا دڵخۆشی ئێمە بەستەنیی رۆژانەی یەكشەممە بوو. لەو

هەژدە ساڵەدا کە من لەوێ بووم، تەنیا جارێك رووداوێکی سەرنجڕاکێش رووی دا، ئەویش ئەو کاتە بوو کە ئەمبار ئاگری گرتو سووتا. ئێمە مەجبوور بووین نیوەشەو هەستینو جلەکانمان لەبەر بکەین، کە ئەگەر بیناکە ئاگری گرت، ئامادە بین. بەڵام بیناکە ئاگری نەگرتو ئێمە دیسان چووینەوە نێو نوێنەکانمان.

هەموو کەس پێی خۆشە لەگەڵ کارەساتی چاوەڕوان نەکراو بەرەوڕوو بێ. ئەمە لە ژیانی مرۆڤدا شتێکی ئاسایییە. ژیانی من بێ کارەساتو رووداو رادەبرد تا رۆژێك خاتوو "لیپیت" بانگی کردمو پێی گوتم کە بەڕێز "جان ئیسمیت" دەیەوێ بمنێرێتە زانستگە. ئەویش ئەوەندە پەراوێزی بە قسەکانی داو لەژێر لچەوە مەتڵەبەکەی راگەیاند کە نەیتوانی جۆشو تەکانێك لە مندا پێك بێنێ. بابە! من پێم وایە گرینگترین تایبەتمەندیی مرۆڤ هێزی هزرو خەیاڵیەتی. چونکە بەهۆی ئەوەوە مرۆڤ دەتوانێ خۆی لە جێگای کەسێکی دیکە دابنێ. ئەم تایبەتمەندییە ئینسان ئاقڵ، میهرەبانو دڵسۆز دەکاو بە بڕوای من دەبێ ئەو حاڵەتە لە منداڵەکاندا بەهێز بکرێ. بەڵام لە هەتیوخانەی "جان گریر" ئەگەر شتێکی وا لە دەروونی کەسێکدا هەبوایە، ئەو هەستەیان دەکوشت. تەنیا شتێك کە ئەوان زیادەڕەوییان تێدا دەکرد "ئەرك ناسی" بوو.

پێموایە دەبێ منداڵەکان فێر بکەین کارەکان بە شەوقو پێخۆشبوونەوە ئەنجام بدەن، نەك بۆ ئەوەی ئەرکێکیان ئەنجام دابێ.

سەبرکە تا من رێکخراوێکی خێرخوازی بۆ بێدەرەتانەکان ساز دەکەم. من هەموو شەوێك بەو بیرەوە دەنووممو خاڵ بە خاڵی گەڵاڵەی ئەو کارەم لە بەرچاو دایە. بیر لە وردەکاریەکانی دەکەمەوە. خواردەمەنی، جلوبەرگ، وانە، رابواردنو تەنانەت سزادانیشم لەبەرچاو گرتووە. دیارە بێ سزادان کارەکان ناچێتە پێش. چونکە لەنێو هەتیوە چاکەکاندا کەسی خراپیش پەیدا دەبێ. بەڵام ئەوەی

بێئەملاو ئەولایە دەبێ منداڵەکانی هەتیوخانەی من بە گیانو دڵەوە شادو خۆشحاڵ بن. ئەگەر گەورە بوونو ئاستەنگ هاتە سەر ڕێگایانو کێشەی جیددی‌یان بۆ هاتە پێش، گرینگ نیە، گرینگ ئەوەیە کە دەبێ بیرەوەریی خۆشیان لە کاتی منداڵیان هەبێ.

ئەگەر ڕۆژێك خۆم منداڵدار بووم هەوڵ دەدەم کێشەو نیگەرانیەکانی خۆمیان لێ بشارمەوە (زەنگی کلیسا لێدرا لە هەلێکی دیکەدا پاشماوەی نامەکەت بۆ دەنووسم)

پێنجشەمە

ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ وەختێك لە ئەزموونگە هاتمەوە، سمۆرەیەك لەسەر مێزی چایی خواردن هەڵتروشکابوو، بادامەکانی دەخوارد. ئێستا کە هەوا گەرمی کردووەو ئێمە ناچارین پەنجەرەکان بکەینەوە زۆر جار دەبێ چاوەڕوانی ئەو میوانە نەخوازراوانە بین.

ڕەنگە پێت وابێ چونکە ئێوارەی هەینی‌یەو ئەمڕۆ دەرسمان نەبوو، شەوێکی ئاسوودەم هەبووەو خەریکی خوێندنەوەی کتێبی "ئیستیونس" بووم کە بە پارەی خەڵاتەکەم کڕیومە؟ نەخێر وا نیە. ئەگەر وا بیر بکەیەوە دیارە هەرگیز لە زانکۆی کچاندا نەبووی. بابە گیان، شەش لە هاوڕێکانم هاتنە ئێرە کە شکولات درووست بکەن. یەکێك لەوان کەمێکی ڕژاندە سەر باشترین قاڵیچەکەم کە قەت پەڵەکەی پاك نابێتەوە.

لەم دواییانەدا لەبارەی وانەکانمەوە شتێکم نەنووسیوە. چیت بۆ بنووسم؟ زۆر باش خەریکی خوێندنم. زۆرم پێ خۆشە کە جاروبار وانەکانم وەلانێمو لەبارەی مەسەلەکانی ژیانەوە لەگەڵت بدوێم. هەرچەند هەموو کات ئەم قسانە یەکلایەنە

بووه، بەڵام سووچەکە لە تۆوەیە. من هەمیشە ئارەزووم بووە نامەیەکم لـە لایـەن تۆوە پێ بگا. نووسینی ئەم نامەیە سێ ڕۆژ درێـژەی کێشـاو هـەرکات هـەڵێکم گیر دەکەوت چەند دێرم دەنووسی ڕەنگە زۆرم ماندوو کردبی.

خوات لەگەڵ بەڕێزی باش

جوودی

## جەنابی بابە لاق درێژ "ئیسمیت"

پاش تەواوکردنی وانەی "مەنتیق"و خوێندنی شێوەی کورت کردنەوەی "عبارات" واتە رەوشی نووسینی وتار بە کورتیو پوختی، بڕیارم داوە بەم شێوازەی خوارەوە نامە بنووسم کە هەم بە باشی مەتڵەبەکەم گەیاندبێو هەم درێژدادڕیشم نەکردبێ.

١ـ لەم حەوتووەدا ئەم تاقیکاریانەی خوارەوەمان بوو:

ئەلف: شیمی

ب: مێژوو

٢ـ دەیانەوێ نوستنگەیەکی کشتی ساز بکەن:

ئەلف: کەرەستەی بینا بریتین لە:

ـ خشتی سوور

ـ بەردی خۆڵەمێشی

ب: گونجایشی نوستنگە بریتییە لە:

ـ یەك سەرۆك، پێنج یاریدەدەر

ـ ٢٠ خوێندکار

ـ ١ دەرکەوان، ٣ چێشکەر، ٢٠ خزمەتکار بۆ سەر مێز، ٢٠ کەس بۆ خاوێنکردنەوەی ژوورەکان.

٣ـ ئەمشەو بۆ دێسێر ماستی شیرینمان هەبوو

٤ـ خەریکم وتارێك لەبارەی سەرچاوەی نمایشنامەکانی شکسپیرەوە دەنووسم.

٥ـ پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ "لومەك ماهۆن" لە یاریی بەسکێتباڵدا لە ئەرز

درا.

ئەلف ـ شانی لەجێ چوو

ب ـ ئەژنۆی رەش بۆوە

٦ـ کڵاوێکی نوێم کڕیوە کە بەم شێوەیە جوانکاری لەسەر کراوە

ئەلف ـ تێلمی مەخمەرینی شین

ب ـ دوو "پەڕ"ی گەورە

ج ـ سێ گوڵەنگی سوور

٧ـ کاتژمێر ٩:٣٠ خولەکە

٨ـ شەوباش

**٢ی ژوئەن**

**بابە لاق درێژی خۆشەویست**

**نازانی چ رێکەوتێکی باش رووی داوە**

•

بنەماڵەی "مەك براید" داوایان لێ کردووم ئەم هاوینە لای ئەوان بم لە خێوەتگەی "ئادیرون داکز". ئەو خێوەتگە (باشگا)یەکە لە قەراخ دەریاچەیەکی جوان لە ناوەڕاستی لێرەوار دایە. برێك لە ئەندامانی یانەکە لەنێو لێرەوارەکەدا ماڵیان لەدار درووست کردووە، لەسەر دەریاچەکەش سواری بەلەم دەبن و بە پێیانیش لەم خێوەتگەوە دەچن بۆ ئەو خێوەتگە. حەوتووی جارێکیش لە یانەدا جێژن و سەمایە. "جیمی مەك براید" یەکێك لە هاوڕێیانی زانکۆی بانگهێشت کردووە کە ئەم هاوینە لای ئەوان بێ. کەواتە پیاو ئەوەندە هەن کە لەگەڵمان سەما بکەن.

پێم وایە خاتوو "مەك براید" زۆری لوتف کردووە کە ئێمەشی بانگهێشت کردووە. تۆ پێت وا نیە؟ وادیارە پشووی کریسمەس کە لە لایان بووم، رەفتاری منی بەدڵ بووە. داوای لێبووردن دەکەم کە ئەمجارە نامەکەم زۆر کورتە. ئەمەشم بۆیە نووسی کە بزانی لە پشوی ئەم هاوینەدا وەزعم چۆنە.

بە خەیاڵی ئاسوودەوە

بچووکت جوودی

### ٥ی زووئەن

### بابە لاق درێژی ئازیز

ئێستا نامەیەکم لە سکرتێرەکەتەوە پێ گەیشت. نووسیویە کە بەڕێز "ئیسمیت" پێی خۆش نیە بانگهێشتی خاتوو "مەك برایە" قبوول بکەم. وای پێ باشترە وەك سالی رابووردوو بچم بۆ "لاك ویلو".

بابەگیان! بۆچی! بۆچی! رەنگە پێت وابێ دەبم بەهۆی زەحمەت بۆیان. بەلام وا نیە. بەڕاستی خاتوو "مەك براید"پێی خۆشە لایان بم. من یارمەتییان دەدەم. ئەوان بە رادەی پێویست خزمەتکاریان نیە. منو "سالی" زۆریان یارمەتی دەدەین. ئەمە هەلێکی باشە کە لێیانەوە فێری مالداری ببم. چونکە هەموو ژنێك دەبێ فێری مالداری ببێ. ئەوەی تا ئێستا فێری منیان کردووە راگەیشتن بە هەتیوخانە بووە نەك مالداری.

کچێك لە تەمەنی مندا لە خێوەتگەدا نیەو خاتوو "مەك براید" پێی خۆشە من لەگەل "سالی" بم. منو "سالی" بڕیارمان داوە کتێبێکی زۆر بخوێنینەوە. مامۆستا پێی گوتوین خوێندنەوەی چەندین کتێبێك بۆ سالەکانی داهاتووی ئێمە زۆر زۆر پێویستە. ئەگەر هەردوومان پێکەوە بیانخوێنینەوە زۆر باشتر لێیان تێدەگەم.

لە لایەکی تر ژیان لە مالێکدا لەگەل دایکی "سالی" ئاکامەکەی ئەوە دەبێ کە باشتر فێر دەبینو پەروەردە دەبین. دایکی "سالی" یەکێك لە خۆشمەشرەفترینو جوانترینو میهرەبانترین ژنێکە کە من تا ئێستا دیومە. لە هەموو کارێکدا

پسپۆڕە. وەبیری خۆتی بێنەوە، من چەند ساڵ هاورینان لەگەڵ خاتوو "لیپت"دا ژیاوم. ئێستا زۆرم پێ خۆش دەبێ لەگەڵ کەسێك بژیم کە تا ئەو رادەیە لەگەڵ خاتوو "لیپت" جیاوازیی هەیە. وا مەزانەماڵەکەیان بچووکەو جێگایان پێ تەنگ دەکەم. ماڵەکەیان وەك لاستیك کێشی دێ. لەگەڵ ئەوەی میوانێکیان بۆ بگا چەند خێوەتێکی دیکە هەڵ دەدەن. کورەکان دەنێرنە ئەو خێوەتانە. شوێنێکی ئاوا چەندە خۆشەوبۆ وەرزش‌و لەشساخی "جیمی مەك برایەد"ی برای "سالی" بەڵێنیی پێ داوم فێری سواریی ئەسپ، تفەنگ هاوێشتن‌و سەوڵ لێدانم بکا. ئەمە ئەو کارانەیە کە هەموو کەس دەبێ بیانزانێ. ئەمە جۆرێك ژیانی ئاسوودەو بێ‌تەنگ‌و چەڵەمەیە کە من تا ئێستا نەمبووە. هەر کچێك لانیکەم دەبێ جارێك ئەم شێوە ژیانە تاقی بکاتەوە.

دیارە تۆ هەرچی بفەرمووی من وا دەکەم. بەڵام بە خوات سوێند دەدەم ئەگەر ئیمکانی هەیە رێگام بدە برۆم بۆ ئەوێ. من تا ئێستا ئەوەندە تامەزرۆی شتێك نەبووم. ئەوەی کە ئەم تکایەت لێ دەکا "جروشا ئابوت" نووسەری گەورەی داهاتوو نیە. بەڵکوو تەنیا "جوودی"یە. تەنیا کچێك.

**٩ی ژوئەن**

**بەڕێز "جان ئیسمیت"**

گەورەم! نامەی ڕێکەوتی حەوتی ژوئەنی ئێوەم پێ گەیشت. بەپێی فەرمانی جەنابت کە بەهۆی سکرتێرەکەتەوە پێت ڕاگەیاندبووم، ڕۆژی هەینی داهاتوو بەرەو کوێستانەکانی "لاک ویلو" وەڕێ دەکەوم.

لەگەڵ ڕێزدا ـ "جیرۆشا ئابۆت"

**کوێستانی "لاك ویلو"**

**سێیەمی ئووت**

**بابە لاق درێژی خۆشەویست**

نزیکەی دوو مانگە هیچم بۆ نەنووسیوی. دەزانم کارێکی باشم نەکردووە. بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە ئەمساڵ تۆم زۆر خۆش ناوێ. نازانی نەچوونم بۆ خێوەتگای بنەماڵەی "مەك برايد" چەندە بوو بە هۆی نائومێدیو دڵگرانیم.

دیارە ئەوە دەسەلێنم کە تۆ گەورەو سەرپەرستی منیو دەبێ لە هەموو کارێکدا رێز بۆ فەرمانەکانت دابنێم. بەڵام من هۆی ئەو کارەی تۆم نەزانی. پێم وایە باشترین هەلێك بوو کە لەدەستم دا. ئەگەر من بابە بوایەمو تۆ "جوودی" دەمگوت: "برۆ رۆڵەگیان شاد بە. لەگەڵ کەسانێکی نوێ ئاشنا بە. بحەسێوەو خۆت بۆ ساڵێکی دیکەی خوێندن ئامادە بکە. برۆ خوا بتپارێزێ".

کەچی ئەوکارەت نەکرد تەنیا یەك رستەی وشكو بێرۆحدا کە بەهۆی سکرتێرەکەتەوە پێم راگەیەندرا، بڕیار درا برۆم بۆ کوێستانی "لاك ویلو".

هەر ئەم فەرمانە ناڕاستەوخۆیانەیە کە لەسەر هەستو سۆزی ساکاری من شوێن دادەنێ. ئەگەر تۆزقاڵێك لەو خۆشەویستییەی کە من سەبارەت بە تۆ هەمە، تۆش بۆ منت هەبوایە، لەباتی ئەو نامە کورتو چاپ کراوە، جاروبار چەند وشەیەکت بە دەستوخەتی بەرێزی خۆتانت بۆ دەنووسیم. ئەگەر بمزانیبا منت خۆش دەوێ، بۆ ئەوەی شادو دڵخۆشت بکەم، هەموو کارێکم دەکرد.

دەزانم هەر لە رۆژەکانی ئەوەڵەوە بڕیار وابوو کە بەرێزو ئەدەبەوە نامەت بۆ

بنووسمو هیچکاتیش چاوەڕێی وەڵامی نامەکان نەبم. هەموو ئەوانەی کە بڕیارت دابوو بە تەواوی بەڕێوەت بردو مـن ئێسـتاش بـەهۆی یارمـەتیی تـۆوە وانـەکانم دەخوێنم. لەوانەیە پێت وابێ من بە پێچەوانەی ئەو بڕیاراتە رەفتار دەکەم.

بەڵام بابە گیان بڕوا بکە مەرجـەکانی ئـەو رێکەوتنـە زۆر گرانـە. تـۆ نـازانی چەندە تەنیام. من کەسـێکی خـەیاڵیم لـە زەینـی خۆمـدا پـەروەردە کـردووە کـە لەوانەیە "تۆ"ی راستەقینە لەگەڵ ئەو "تۆ"یەی کە لە زەینی من دایـە بـە هـیچ شێوەیەك لە یەك نەچن.

جارێکی کە لە نەخۆشخانە کەوتبووم، کارتێکت بۆ ناردم کـە مـن لای خـۆم رامگرتووەو هەر کاتێك هەست بە تەنیایی بکەم، ئەو کارتە دەردێنمو دیسـانەوە دەیخوێنمەوە.

ئەم نامەیەم بۆ نووسینی ئەم شتانە دەست پێ نەکرد. بەڵکوو پێشم وایـە زۆر ناپەسەندە کە مرۆڤ ئاوەهـا یەکلایەنـە، خۆپەسـەندانەو زاڵمانـە کەسـێك بداتـە دەستی "قەدەر". بەڵام ئەگەر کەسێکی وەك تۆ دەستبڵاوۆ میهرەبان وای گەرەك بێ، دەبێ بەپێی خواستی ئەو رەفتار بکرێ.

باشترین کارێك کە دەتوانم بیکەم ئەوەیە کـە لێـت ببـوورمو دیسـانەوە شـادو خۆشحاڵ ببمەوە. بەڵام کە دەبینم "سـالی" لـە نامەکەیـدا بـۆم دەنووسـێ ئـەوان چەندە خۆشیان لێ رادەبرێ من ماتو مەلوول دەبم.

هەرچۆنێك بێ لە رابووردوو چاوپۆشـی دەکـەمو دەسـت دەکـەم بـە نووسـینی هەواڵە نوێکان. لەم هاوینەدا زۆر بە باشی خەریکی نووسین بووم. تا ئێستا چوار کورتە چیرۆکم تەواو کردووەو ناردوومن بۆ چـوار گۆڤـاری جیاجیـا. دەبینـی بـۆ ئەوەی ببمە نووسەر چەند سەخت تێدکۆشم. لە تەنیشـت هەیوانەکـەدا ژوورێکـی کارم بۆ خۆم دیاری کردووە. هەر ئەو جێگایە کە بەڕێز "جروی" لـە رۆژی بـاران

بارینددا یاری تێدا کردووە. ئەم ژوورە زۆر فێنکە. دوو پەنجەرەی ئامال لێژی بۆ خوارێ هەیە کە دارە "ئەفرا"[1]کان سێبەری داوێنە سەر. چەند سمۆرەی سووریش لە سووچێکدا هێلانەیان کردووە.

پاش چەند رۆژێکی تر نامەیەکی باشترت بۆ دەنووسم و تەواوی هەواڵەکانی ئەم کوێستانەی تێدا دەگونجێنم.

ئێمە پێویستیمان بە بارانە
جودیی هەتا هەتایی تۆ

---

[1] ئەفرا دارێکە بەرز وەك چنار، پەلوپۆو سێبەری زۆری هەیە، بەرزایی دەگاتە ٢٠ مەتر

**١٠ی ئووت**

**بەڕێز بابە لاق درێژ**

مـن ئـەم نامـەت بەسـەر دوو پـەلی داری شـۆڕەبییەك لـە قـەراخ جۆگـای لەوەرگەکەوە بۆ دەنووسـم. لـە خـوارەوە بۆقێـك قـیرەی دێ. کوللەیـەك لـەسـەرەوە گۆرانی دەڵێ. دوو مـارمێلکە بە دارەکەدا هەڵدەگەڕێن. کاتـژمێرێك دەبـێ لێـرە دانیشتووم. دوولکانێکی زۆر باشە. بەتایبەت دوو پاڵەپشتی قەنەفـەی هۆڵەکـەم لەگەڵ خۆم هێناوەو لەژێر لاقمدا دامناون. پێنووس‌و کاغەزم پێیە. بەو هیوایـەی کورتە چیرۆکێکی تازە بنووسم. بەڵام پاڵەوانی چیرۆك زۆرم ناز بۆ دەکاو گوێم بۆ ڕاناگرێ، منیش ئەوم وەلانـاوەو خـەریکم نامـە بـۆ تـۆ دەنووسـم (هەرچـەند تـۆ بەپێی خواستی من رەفتار ناکەی. چ فایدە؟).

ئێستا کە تۆ لە کەشوهەوای ناخـاوێنی نیویـورك دای، بریـا دەمتـوانی لـەم هـەوا خاوێنـەی ئێـرەم بـۆ دەنـاردی. بەتایبـەت ئـەم دیمەنـە جوانانـە کـە پـاش حەوتوویەکی باران بارین وەك بەهەشتی لێ هاتووە. ڕاسـتی نـاوی بەهەشـتم بـرد بەڕێز "گلوك"م وەبیر هاتەوە. ئەگەر لەبیرت بێ هاوینی ساڵی رابووردوو لەبارەی ئەوەوە بۆم نووسیبووی؟ ئەو قەشەی کلیسایەکی نزیك لە ئێمە بوو. ئەو چارەرەشـە زستانی رابووردوو بە نەخۆشیی "سینە پاڵوو" مـرد. مـن چـەند جـار چـووم بـۆ بیستنی ئامۆژگارییەکانی‌و زۆر باش بە بـیرو بـاوەڕە ئایینیـەکانی ئـەو ئاگـادار بووم. ئەو کاتی مردن بـە بیروبـاوەڕی خـۆی وەفـادار بـوو. مـن پـێم وایـە ئەگـەر کەسێك ٤٧ ساڵ بە ڕێگای ڕاستی خۆیدا بـڕواو تۆزقاڵێـك لێـی لانـەدا، دەبـێ

وەك شتێكی بەقیمەتو نایاب لە شوێنێك رابگیرێ. هیوادارم جێگای بەهەشت بێ‌و هاودەمی پەرییەكان بێ. ئەو دڵنیا بوو كە بە بەختەوەری دەگا. ئێستا بە جێگای ئەو گەنجێكی ناشارەزا ئەو كلیسایە بەڕێوە دەباو خەڵك لێی رازی نین. لایەنگرانی "كمینگر" دەیانویست بین بە دوو قۆڵ. چونكە خەڵكی ئەم دەڤەرە بڕوایان بە نوێخوازی نیە.

لەو حەوتووەدا كە باران دەباری، تەواوی كات لە ژووری تەنیشت بەر هەیواندا دادەنیشتمو بە خوێندنەوەی كتێبەوە خەریك بووم. زۆرتری كتێبەكانی "ئیستیونیسن"م خوێندوەتەوە. پێم وایە بۆ ئەوەی كەسایەتیی چیرۆكەكانی سەرنجڕاكێش بن، كەسایەتیی خۆی لە قاڵبی پاڵەوانانی داستانەكانیدا گونجاندووە.

زۆر سەیرە. هەموو ئەو دەهەزار دۆلارەی كە بابی پێی بەخشی، سەرفی كڕینی بەلەمێكی تایبەتیی كرد. پاشان چارۆكەی باگری بەلەمی لێ هەڵكردو بەرو دەریای باشوور وەڕێ كەوت. بەم چەشنە ئەو بە بڕوای خۆی كە ئۆگریی رووداوەكان بوو وەفادار مایەوە.

ئەگەر بابی منیش دەهەزار دۆلاری بۆ دانابام منیش هەر ئەو كارەم دەكرد. زۆرم پێ خۆشە بۆ ناوچە گەرمەكان سەفەر بكەم. پێم خۆشە هەموو جیهان بگەڕێم. من رۆژێك ئەو كارە دەكەم.

رۆژێك ببم بە نووسەرێكی ناودار، یان ببم بە هونەرمەندێك، یان یەك وێنەگر، یان كەسایەتییەكی گەورە، بە بێ دوودڵی ئەو كارەدەكەم. من شەیدای سەفەرو گەڕانو ئاوارەییم. پێم خۆشە كڵاوەكەم لەسەر نێم، چەترەكەم بەدەستەوە بگرمو وەڕێكەوم. پێش ئەوە بمرم دەبێ دار خورماكانو پەرستگەكانی باشوور ببینم.

ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممە لە بێلای دەرکەدا دانیشتبووم. زۆرم لەبەر گرانە مەتلەبێك هەیە وەك هەواڵ بۆتی بنووسم. "جوودی" لەم دواییانەدا بووە بە فیلسوفێك کە پێی خۆشە لەبارەی هەواڵە گشتییەکانی جیهانەوە بدوێ، نەك شتە کەم بایخەکانی ژیان. بەلام ئەگەر بەڕاستی هەواڵە وردەکانت پێخۆشە فەرموو لەگەڵ ئەم هەواڵانە:

سێشەممەی حەوتووی ڕابووردوو هەر نۆ بەرازەکانمان لەنێو جۆگا ئاوەکەوە هەڵاتن. هەشتیان لێ گەڕانەوە. پێم خۆش نیە نادادوەرانە کەسێك گومانبار بکەم بەلام وا هەست دەکەم بەرازەکانی ژنی خوالێخۆشبوو "داود"[1] یەکیان لێ زیاد بووە.



وێنەی بەرازەکان

[1] Dowd

بەڕێز "ویوریر"[1] تەوێڵەو ئەمبارەکەی بە زەردێکی کودوویی ڕەنگ کردووە. ڕەنگێکی زور ناشیرینە. بەڵام خری دەڵێ بەم زووانە ڕەنگەکەی جوان دەبێ. بنەماڵەی "بریویر"[2] ئەم حەوتووەمیوانیان دەبێ. خوشکی خاتوو "بریویر" دوو کچی، هەن کە لە "ئوهایو"وە دێن.

یەکێك لە مریشکەکانی ئێمە کە لە نەژادی "ڕێد ـ تایلەند ـ ردز"ە. لە پانزدە هێلکە کە نابوومانە ژێری تەنیا سێ جوجکەی هەڵێناوە. هۆکەی نادیارە. پێم وایە ئەمانە خراپترین مریشکن. من نەژادی "بوف ئەرپینگلتون"م پێ باشترە.

کارمەندە نوێکەی ئیدارەی پۆستی "بانی ریك" یەك "بتڵ" جینی جامایکای ئیداری کە بایی ٧ دۆلار بوو، بێ ئەوە کەس پێی بزانێ تا دواتنۆکی خواردوەتەوە.

"ئەبراهاج"ی بەساڵاچوو بەسەختی تووشی نەخۆشیی "روماتیسم بووە. لە هەموو خراپتر ئەوەیە کە ئەم پیاوە کاتێك گەنج بووەو توانیویە پارەی باش بەدەست بێنێ، شتێکی بۆ ڕۆژی تەنگانە پاشەکەوت نەکردووە. ئێستا دەبێ خەڵك یارمەتی بدەن.

شەممەی داهاتووجێژنێك لە فێرگە ساز دەکرێ بەستەنیشی تێدا دەدەن. تۆش لەگەڵ هەموو بنەماڵە تەشریف بێنن.

من کڵاوێکی تازەم کڕیوە بە ٢٥ سێنت. ئەمەش دوایەمین وێنەی منە. لەو کاتەی کە دەچووم بۆ کۆکردنەوەی گزرە ئەم وێنەیان لێ کێشاوم.

---

[1] Wearer
[2] Brewer

هەوا تاریکی کردووە ناتوانم بنووسم. هەواڵەکانیش کۆتاییان پێ هات.

شەوباش

جوودی



وێنەی جودی بە کڵاوەکەیەوە

## هەینی

بەیانیت باش! ئەمەش چەند هەواڵی تازەی دیکە! بزانم پێت چۆنە؟

هەرگیز، هەرگیز بەبیرتدا نایە کە کێ دەیەوێ بێ بۆ "لاك ویلو".

نامەیەك لە لایەن بەڕێز "جروی پندلتون"ـەوە بۆ خاتوو "سمپل" هاتووە لەبەر ئەوە کە بە ماشین دەچێ بۆ "یوکشایر"و هەندێك ماندووە، پێی خۆشە لە کوێستانێکی جواندا چەند ڕۆژێك بحەسێتەوە. ئەگەر شەوێك پەنا بۆ ئێرە بێنی خاتوو "سمپل" دەتوانێ ژوورێکی ئامادەی هەبێ بۆی.

بەڕێز "پندلتون" لەوانەیە یەك دوو حەوتوو یان سێ حەوتوو لێرە بمێنێتەوەو ئەوەش بەوەوە بەستراوەتەوە کە چەندەیان مەجال دەبێ.

نازانی چ بێنەو بەرەیەکە. هەموو بیناکە وەك چەپکەگوڵ پاكو خاوێن کراوە. پەردەکانیان شتوون. بڕیارە بەیانی زوو من بڕۆم هەندێ مشەما بۆ داڵانو دوو قووتوو ڕەنگی قاوەیی بۆ پلیکانەکانی پشتەوەی سەرسەرا بکڕم. خاتوو "داود" سبەی دێ بۆ خاوێنکردنەوەی پەنجەرەکان (بەهۆی ئەم کارانەوە مەسەلەی ون بوونی بزنەڵە بەرازەکە لەبیر چۆتەوە).

ڕەنگە پێت وابێ ماڵەکە لەپێشدا خاوێن نەبووبێ، بەڵام ئەوە بزانە کە دەکرێ هەر ڕەخنەیەك لە خاتوو "سمپل" بگیرێ بێجگە لە ماڵداری.

بابەگیان! داخوا ئەم کارەی جەنابی "پندلتون" لە کەمفکریی تایبەتیی پیاوانەوە سەرچاوە ناگرێ؟ ئەو بە هیچ شێوەیەك ئیشارەی بەوە نەکردووە کە کەی تەشریف دێنێ. ئەمڕۆ؟ سبەی؟ یان حەوتوویەکی دیکە؟

هەموو چاوەڕێن کەی تەشریف دێنێ. ئەگەر درەنگتر بێن دەبێ جارێکی تر

ماڵەکە خاوێن بکرێتەوە.

"ئامانسی"، "کرۆری" بە گارییەکەوە بەستووەو چاوەڕێی منە. خۆم لێی دەخورم. ئەسپێکی باشە. نیگەران مەبە.

دەستم دەخەمە سەر دڵم و دۆعای خێرت بۆ دەکەم

جوودی

شەممە

### دیسانەوە بەیانیت باش

دوێنێ کاتێك پۆستچی هات یەشتا ئەم نامەیەم نەخستبووە پاکەت. کەوابوو چەند وشەی دیکەی لێ زیاد دەکەم.

پۆستچی رۆژی جارێك، کاتی نیوەڕۆ نامەکان دێنێ. بڵاوکردنەوەی نامەکان بە شێوەی گوندنشینەکان، خۆشییەکی تایبەتیی هەیە. ئەم پۆستچییە بێجگە لەوە نامەکان دەگەیەنێ ئەگەر پێنج سێنتی بدەنێ، دەچێت بۆ شارو هەواڵ دێنێتەوەو ... شتومەکیشمان بۆ دەکڕێ.

دوێنێ بە تەنیا ١٠ سێنت چەند قەیتانی کەوش، شوشەیەك کرێم (پێش ئەوە کڵاوە نوێیەکە بکرم، خۆر پێستی لووتی سووتاندم)، قوتویەك بۆیەی رەش‌و تێلمێکی شینی بۆ کڕیم. چاکییەکی دیکەی پۆستچی ئەوەیە کە هەواڵەکانمان بۆ دەگێڕێتەوەو پێمان دەڵێ چ کارەساتێك لە کام گۆشەی جیهان رووی داوە.

چەند کەسێك هەن کە رۆژنامەیان بۆ دێ، پۆستچی کە دەچێ بۆ بڵاوکردنەوەیان، رۆژنامەکان دەخوێنێتەوە، مەتلەبەکان بۆ ئەوانەی کە رۆژنامە ناکڕن دەگێڕێتەوە. بەم پێیە ئەگەر شەڕێك لەنێوان ئامریکاو ژاپۆندا روو بدا، یان سەرۆك کۆمارێکی ئامریکا بکوژرێ یان جەنابی "راکفلێر" یەك ملیۆن دۆلار بە هەتیوخانەی "جان گریر" ببەخشێ، هیچ پێویست ناکا تۆ ئەم هەواڵانە بنووسی. دەتوانی دڵنیا بی کە هەموو ئەم هەواڵانەم پێدەگا.

یەشتا لە رۆژی هاتنی بەڕێز "جروی" بێهەواڵین. بەڵام ئەگەر بزانی ماڵ چەندە خاوێن کراوەتەوەو ئێمە چۆن پێش ئەوە بێینە ماڵەوە قاچەکانمان خاوێن

دەکەینەوە! خوا بکا کەسێك پەیدا ببێ کە بتوانم چوار وشەی لەگەڵ بدوێم. قسەکردن لەگەڵ خاتوو "سمپل" هەندێ جار مرۆڤ ماندوو دەکا.

حەڵکی ئێرە کارەکانیان جێگای پێکەنینە. دنیای ئەوان ئەم گردە[1]یە. لەگەڵ خەڵکی دیکە ناگونجێن. دەزانی دەمەوێ چی بڵێم. راست وەك رێکخراوی "جان گریر" کە بیرو بڕوای ئێمە لە چواردیوارو حەوشەکەی واوەتر نەدەچوو. لەو کاتانەدا زۆر بیرم بەو شتانە نەدەدا چونکە مندال بوومو ئەرکی دیکەشم زۆر بوو. نوێنەکانم رێكو پێك دەکردن، دەموچاوی منداڵەکانم دەششتن، دچووم بۆ فێرگە، عەسران دیسان دەستو دەموچاوی منداڵەکانم دەششتنەوە، گۆرەوێم دەدرووەوە، پاتۆڵی "فێردری پرکنیز"م پینە دەکرد (فیردی هەموو رۆژێك پاتۆڵەکەی دەدڕاند)، لەگەڵ هەموو ئەم کارانە دەرسەکانیشم دەخوێندن، جا ئەجار لەنێو نوێنەکەمدا رادەکشام.

ئەوەندە ماندوو هیلاك دەبووم کە هیچکات کەمایەسییە کۆمەڵایەتییەکانم هەست پێ نەدەکرد. بەڵام پاش دوو ساڵ ژیان لە زانکۆیەکی پڕ هەراوهوریاو جەنجاڵ، هەست دەکەم نیازم بە هاتوچۆو دۆستایەتی لەگەڵ کەسانێك هەیە کە لە زمانی یەك حاڵی بین. ئەگەر کەسێك ببینم کە لە یەکتر تێدەگەین زۆر خۆشحاڵ دەبم. دەی بابە گیان. نامەکەم کۆتایی پێ هاتو هەواڵی نوێشم پێ نیە. نامەی دواتر بە درێژی دەنووسم.

جودیی هەمیشەیی تۆ

پەیوەستی نامە:

چونکە سەرەتای ئەم وەرزە بارانی باش نەباری، کاهووەکانی ئەمساڵ باش

---

[1] گرد: تەپۆلکە

نین.

## ٢٠ی ئووت

بەڵێ بابە! جەنابی "جروی" لێرەیەو زۆرمان بەخۆشی لێ رادەبرێ. لانیکەم من زۆرم خۆش لێ رادەبرێ. پێم وایە بەوانی تریش هەر خۆش رادەبرێ. ماوەی دە رۆژە لێرەیەو چووکترین ئاماژەیەك لەبارەی رۆیشتنەوە ناکا. خاتوو "سمپل" ئەوەندەی بەدەورو پشت دا دێ کە من شەرم دەکەم. ئەگەر لەکاتی منداڵیشدا ئاوای رەفتار لەگەڵ کردبێ، زۆر سەیرە بەڕێز "جوودی" بەو باشییە لە کەڵ دەرهاتووە.

میزێکی بچووکیان لە گۆشەی هەیوان داناوە. منو بەڕێز "جروی" لەسەر ئەو میزە نان دەخۆینو جاروباریش لەژێر دارەکاندا. ئەگەر هەوا زۆر سارد بێ لە یەکێك لە باشترین دیوەکاندا نان دەخۆین.

بەڕێز "جروی" لە هەر جێگایەك پێی خۆش بێ نان دەخوا. "کاری" بە میزێکی بچووکەوە بەشوێن جەنابی "جروی"وەیە. ئەگەر مەوداکە دوور بێو ببێتە هۆی ماندووبوونی، کاتێك دەفرەکان کۆ دەکاتەوە، یەك دۆلاریەك لەژێر قەندانەکەدا دەدۆزێتەوە.

ئەگەر کەسێك بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێز "جروی" ببینێ هەرگیز تەنانەت فکر ناکاتەوە پیاوێکی ئەوەندە کۆمەڵایەتییە. لە یەکەم بینیندا "پندلتون"ێکی راستەقینەیە. کەچی تۆزقاڵێکیش بەلای ئەواندا نەچووە. پیاوێکە دڵپاك، باش، ساکارو لەبەر دڵانە. هەرچەند ئەم پەسنە بۆ پیاو نابێ، بەڵام پەسنێکی راستە. بەڕێز "جروی" لەگەڵ گوندنشینەکانی ئەم دەڤەرە زۆر میهرەبانە. لەپێشەوە

گوندنشینەکان زۆر بە پارێزەوە لەگەڵی ڕووبەڕوو دەبوون. بەڵام کاتێک هەڵسوکەوتی دۆستانەی ئەویان دی بە جارێك تەسلیم بوون. ئەوان خۆشیان لە جلوبەرگەکانی "جروی" نەدەهات. ڕاستییەکەی ئەوەیە منیش ئەو جلانەم زۆر بەلاوە سەیرو سەمەرە بوو. بۆ نموونە شارواڵی کورتی کێشدارو جاکەتی چیندار، یان شارواڵی "فلافل"[(1)]ی سپی، یان جلوبەرگی سواریی ئەسپ بەو شارواڵە فشەوە لەبەر دەکا.

هەرکات بە جلی نوێوە لە ژوورەکەی خۆی دێتە دەرێ، خاتوو "سمپل" بە زەردەخەنەوە سەرنجی دەداو پێی دەڵێ ئاگات لێبێ لە شوێنێك دانەنیشی جلەکانت پیس یان چرچولۆچ بن. بەڕێز پندلتون ئەو قسانەی پێ خۆش نیەو هەموو جارێك لە وەڵامدا پێی دەڵێ برۆ بە کاری خۆت رابگە. من ئێستا منداڵ نیم. ناتوانی وەك منداڵ هەڵسوکەوتم لەگەڵ بکەی. جێگای پێکەنینە پیاوێك بەو لاقە درێژانەوە (بابە! لاقەکانی وەك لاقی تۆ درێژن) زەمانێك لەسەر ئەژنۆی خاتوو "سمپل" دانیشتووەو دەموچاوی بۆ شۆردووە. لەوەش سەیروسەمەرەتر لارانە قەڵەوەکانی خاتوو "سمپل"ـە کە لە زلەییدا دوو نهۆم وەستاون. بەڵام جەنابی "جروی" دەڵێ خاتوو "سمپل" لەو رۆژگارەدا لاواز بووەو زۆر خێراتر لە بەڕێز "جروی" توانیویە هەڵێ.

بیرەوەری و خاترەی زۆرم لەگەڵ بەڕێز "جروی"دا هەیە. یەکەم ئەوە کە بە درێژایی چەند میل دەوروبەری ئێرە گەڕاوین و سەرنجی هەموو شتێکمان داوە. دووەم، ڕاوەماسی فێر بووم، ئەویش بە ئامرازێك کە لە پەل درووست کراوە. سێیەم گوللە هاویشتن بە تفەنگ و حەوتیر فێر بووم و هەروەها سواریی ئەسپیش.

---

(1) فلانل جۆرە قوماشێکی ناسکە لە خوری درووست دەکرێ

باوەڕم نەدەکرد "گـرور" ئەوەنـدە بەهێز بێ. ئێمـە سێ ڕۆژ یـەك لـە دوای یـەك دانەوێڵەی نیسکمان لەبەر کرد. ڕۆژێك گوێلکێکی دی سلەمییەوە، حیلانـدی‌و هەڵیگرتم‌و بەتاو هەڵات.



وێنەی گرور

دوانیەڕۆی ڕۆژی دووشەممە لەگەڵ بەڕێز "جـروی" بـە تـەپۆلکی "ئاسمـان"دا سەرکەوتین. ئەو تەپۆڵکە زۆر لە ئێمە نزیکەو زۆریش بەرز نیـە. بـەفریش لەسـەر ترۆپکـی دەبینـرێ. کـە مرۆڤ پێـیدا هەڵـدەزنێ، هەناسـەبڕکێی پـێ دەکـەوێ. داوێنی بەدار داپۆشراوەو لاسەرووش زەویی بایەرە. ئێمە تـا ڕۆژئـاوا بـوون لـەوێ ماینەوە. نانی شێومان هەر لەوێ ساز کردو خواردمان. بەڕێز "جروی" گوتی لە من باشتر دەزانـێ خـواردنی شـێو ساز بکـاو ئـەو کـارەی گرتـە عـۆدەی خـۆی. ڕاستیشی دەگوت چونکە ئەو بە ژیـان لـە ئوردووگـەدا ڕاهـاتبوو. پـاش مـانگ هەڵاتن لە کێو هاتینە خوارەوەو داگەڕاین بۆ نێو دارسـتان. دارسـتانەکە تاریـك بوو. لەبەر شەوقی چرا لایتی بەڕێز "جروی"دا ملی ڕێگامان گرت.

زۆرمان خۆش لێ ڕابوورد. بە درێژایی ڕێگا بەڕێز "جروی" قاقـا پێدەکـەنی. هەر قسەی خۆشی دەکردو نوکتەی بەتامی دەگێڕاوە. ئەو هـەموو کتێبانـەی کـە من خوێندبوومەوەو زۆر کتێبی زیاتر لـەوەش خوێندۆتـەوە. زۆر سـەیرە کەسـێك

ئەوەندە زانیاریی جۆراوجۆری هەبێ.

ڕۆژی دوایی بۆ ڕێپێوانێکی درێژ وەڕێکەوتین. بەڵام بەداخەوە لێزمە بارانێکی بەخوڕ بوو بە تووشمانەوە. کاتێك گەیشتینەوە ماڵ هەموو جلەکانمان خووسابوو بەڵام ورەمان هەروا بەرزو شاد بووین.

بریا لەو کاتەدا کە ئێمە وەك مشکی لەئاو هەڵکێشراو گەیشتینە چێشتخانە، لەوێ دەبووی‌و قیافەی خاتوو "سمپل"ت دەدی.

ئەو گوتی: ئۆی جەنابی "جروی" خاتوو "جوودی"، خوایە چبکەم. چەندە تەڕوتلیسن. خوا مەرگ؟ چاکەتێك بەو جوانیە چۆن لە حەرام گەڕاوە؟

بابە نازانی چەندە جێگای پێکەنین بوو. ڕاست وەك ئەوە لەگەڵ منداڵ بدوێ لەگەڵمان دەدوا، وەك دایکێکی نیگەران‌و قەڵس. من بۆ ساتێك ترسم لێ نیشت نەکا بۆ ژەمی بەیانی مورەبامان نەداتێ.

شەممە

لەمێژە ئەم نامەیەم دەست پێ کردووەو تا ئێستا کاتی ئەوەم نەبووە تەواوی بکەم.

سەرنجی ئەو کۆپلەیە بدە هی "ئیستیونیس"ـە:

"جیهان بە چەشنێك لە شتی جۆراوجۆر تژییە کە دڵنیام هەموو ئێمە دەتوانین وەك پادشا تێی‌دا بەختەوەر بین.

ئەوە ڕاستە. جیهان پڕە لە شادی‌و خۆشی. بەو مەرجەی هەرچیمان هاتە پێش بە چاکە هەڵیسەنگێنین. هێمای سەرکەوتن لەوەدایە کە مرۆڤ خواستەو چاوەڕوانیی کەم بێ. بەتایبەت لەم شوێنە کوێستانی‌یە شتی جۆراوجۆر کە مرۆڤ بەخۆیەوە خەریك بکا زۆرن. من دەتوانم بە زەویی خەڵکدا بڕۆم‌و تماشای دیمەنەکانی بکەم‌و لە جۆگە ئاوەکانیاندا بەئاو یاری بکەم وەك ئەوە هی خۆم بن.

پێویستیش بەوە ناکا ماڵیاتیان لەپادا بدەم.

شەوی یەکشەممەیە. کاتژمێر دەورووبەری یازدەیە. بەپێی عادەت دەبێ ئێستا نوستبم بەڵام لەگەڵ شێو قاوەی تورکم خواردۆتەوە خەوم لێ زڕاوە. بەیانی خاتوو "سمپل" زۆر بە جیددی بە بە بەڕێز "پندلتون"ی گوت:

- دەبێ کاتژمێر دەو چارەك وەڕێکەوین کە راست کاتژمێر یازدە لە کلیسا بین.

بەڕێز "پندلتون" گوتی:

- زۆر باشە خاتوون. بلێ فایتوون ئامادە بکەن. ئەگەر لەو کاتژمێرەدا ئامادە نەبووم ئێوە لەشوێنم رامەوەستن، خۆتان بڕۆن.

- نا لە شوێنت رادەوەستین

- هەرچۆنت پێ خۆشە، بەڵام با ئەسپەکان زۆر ماتڵ نەبن.

بەڵام لەوکاتەدا خاتوو "سمپل" خەریکی لەبەرکردنی جلەکانی بوو، بەڕێز "جروی" بە "کاری" ئەمر کرد کە شتومەکی فەراوین بۆ ئێمە ئامادە بکاو بە منی گوت کە پێڵاوو چاکەتی سپۆرت لەبەر بکەم لە درگای پشتەوە هەڵاتین و چووین بۆ راوەماسی. ئەم کارە هەموو بەرنامەکانی ماڵێی شێواند.

لە "لاك ویلو" زیاتری رۆژانی یەکشەممە لە کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆدا فەراوین دەخۆن. بەڕێز "جروی" فەرمانی دا کاتژمێر ٧ خواردن ئامادە بکەن. بەڕێز "جروی پندلتون" هەروەخت برسیی با دەستووری نان خواردنی دەدا. راست وەك ریستوران چاوی لە "لاك ویلو" دەکرد. ئەم کارە رێگای لەوەگرت کە ئاماسیو کاری سواری فایتوون بن. بەڕێز "جروی" گوتی. زۆر باشتر. چاك وایە کچێکی گەنج ئەگەر کەسێکی گەورەتر لەخۆی لەگەڵ نەبێ، نابێ لەگەڵ پیاوێك سواری فایتوون ببێ. بێجگە لەوەش خۆمان نیازمان بە فایتوون هەبوو.

لە لایەکی دیکەوە بە بڕوای خاتوو "سمپل" هەر کەسێك ڕۆژی یەکشەممە بچێ بۆ ڕاوەماسی، دەچێتە جەهەننەم. ئێستە کە نەیتوانیوە بەڕێز "جروی" بەو شێوە کە خۆی بیر دەکاتەوە پەروەردە بکا، زۆر بەداخە. بێجگە لەوە دەیویست بەڕێز "جروی: لە کلیسا بە خەڵك پێشان بداو خۆی پێوە بنوێنێ.

هەرچۆنێك بێ ئێمە چووین بۆ ڕاوەماسی (بەڕێز "جروی" چوار ماسی گرت). بۆ ژەمی نیوەڕۆ کەبابمان لێ ساز کردن. بەڵام زۆر جار لەسەر دارەکە دەکەوتنە خوارەوەو کاتی خواردنیان تامی خۆڵەمێشیان دەدا. لەگەڵ ئەوەش خواردمانن.

کاتژمێر چوار گەڕاینەوە ماڵێ‌و کاتژمێر پێنج بە سواری فایتوون چووین بۆ گەڕان. کاتژمێر حەوت نانی شێومان خوارد. کاتژمێر دە هاتم بنووم. ئێستا خەریکم نامە بۆ تۆ دەنووسم‌و کەمێك خەوم دێ.

شەو باش.



وێنەی کیسەڵە ئاوی‌یەکە

ئەمە وێنەی ئەو ماسی‌یەیە کە من گرتم

ئۆ هۆی کاپیتان لاق درێژ

سپلشـك ... زەزدی ... بوهـوو ... و یـەك بـتڵ شـەراب. بـیری لێ بکـەوە کـە دەمهەوێ کامە زمان فێر بم. ئێمە ئەم دوو رۆژە هەر بە زمـانی دەریاوانـان‌و دزە دەریاییەکان دواوین. کتێبی "دورگەی خەزنە" زۆر بە چێژەوە. پێـت وا نیـە؟ تـۆ ئەو کتێبەت خوێندۆتەوە. یان لەوانەیە وەختایەك تۆ مێرمنداڵ بووی هێشتا ئەو کتێبە نەنووسرابێ.

ئیستیونیسن بۆ هەنـدێ لـە چیرۆکەکانی تـەنیا ۳۰ پۆنـد حـەقی نووسـینی وەردەگرت. پێم وایە بوون بە نووسەرێکی بەناوبانگەوە نـەبی سـوودێکی ئـەوتۆی هەبێ. لەوانەیە من لەباتیی نووسەر ببم بە مامۆستا.

بابە! لێم ببوورە کە هەموو نامەکانم پڕن لە نـاوی "ئیستیونیسـن". چـونکە ئێستا هەموکات لەبارەی ئەوەوە بیر دەکەمەوە. کتێبخانەی "لاك ویلـو" تژییـە لە نووسراوەکانی ئەو.

ئەم نامەیە بە دوو حەوتوو نووسرا. پێم وایە بەڕادەی پێویست درێژ بـێ. ئـیتر ناکرێ وابزانی کە هەموو شت نانووسم.

بریا لێرەبای. بێگومان زۆر خۆشمـان لێ رادەبـرد. پـێم خۆشـە هاوڕێـانی مـن هەموو یەکتر بناسن. دەمویست لە بەڕێز "پندلتون" بپرسم کە لە نیـویـورك تـۆ دەناسێ؟ وا بزانم بتناسێ. چونکە شوێنی کارو تێکۆشانی هەمووتان لـە ناوچـە دەوڵەمەندو سەر بەدەرەوەبووەکان دایە. هەردووتان بڕواتـان بـە چاکسـازی هەیـە. بەڵام لەبەر ئەوەی ناوی راستەقینەی تۆم نەدەزانی نەمتوانی ئەو کارە بکەم.

نەزانینی ناوی تۆ زۆر سەیرو سەمەرەیە. تا ئێستا شتێکی وەهام بۆ نەهاتۆتە پێش. خاتوو "لیپت" پێی گوتبووم کە تـۆ بیروبـاوەڕێکی سـەیرت هەیـە ئێسـتا

باوەڕ دەکەم وایە.

لەگەڵ پێشکەشکردنی ڕێزم

جوودنی

پاشکۆ:

کـــە ویســـــتم دیســـــانەوە نامەکـــە بخوێنمـــەوە دیـــتم هـــەمووی لـــەبارەی "ئیستیونیسن"ـەوە نیە، بەڵکوو چەندین جاریش ئامــاژە بــە جــەنابی "جــروی" کراوە.

**١٠ی سێپتامبر**

**بابەی خۆشەویستم**

بەڕێز "جودی" ڕۆیشتووەو هەموومان وەڕەزیی دەکەین. کاتێک مرۆڤ بە کەسێک، یان شوێنێک، یان کارێکەوە ئۆگر دەبێو لەنەکاو لە دەستی دەدا، جێگایەکی چۆڵ لە دڵی ئینساندا جێ دێڵێو حاڵەتێک پەیدا دەکا وەک حاڵەتی دڵپڕی. وتەکانی خاتوو "سمپل"یش دەڵێی خواردەمەنیی بێخوێیە.

تا دوو حەوتووی تر زانکۆ دەکرێتەوە. پێم خۆش دەبێ کە دیسانەوە کارەکەم دەست پێ دەکەمەوە. ئەگەرچی ئەم هاوینەش لە قەدەر خۆم باشم کار کردووە. شەش کورتە چیرۆکو حەوت دەستە شێعرم نووسیوە. ئەوانەم بۆ گۆڤارەکان ناردبوون، بەڵام هەموویان لەگەڵ یادداشتێک بەڕێزەوە نێردرانەوە. گرینگ نیە. ئەزموونێکی باشە. بەڕێز "جروی" هەموویانی خوێندەوە. پۆستچی لەپێشدا دابوونیە دەست ئەو. هەرچۆنێک بێ ئەو خوێندنیەوە، زانی چۆنو گوتی زۆر بێکەڵکن. لەوە دەچێ نووسەر نەیزانیوە چی نووسیوە (بەڕێز "جروی" ڕاستگۆیی لە پاراستنی ڕێزو ئەدەب لەپێشتر دەزانێ). بەڵام دوایەمین چیرۆکی "دووره دیمەنێک لە زانکۆ"ی، پێ خراپ نەبوو. دای چاپیان کردو ناردم بۆ گۆڤارێک. ئێستا دوو حەوتووی بەسەردا تێپەڕیوە وا دەزانم بەم زووانە گەردەلوولێک دەست پێدەکا.

ڕاست لەم لەحزەدا باران بە خوڕم دەستی بە بارین کرد. دەرگاو پەنجەرەکان بە توندی دەکرێنەوەو پێوە دەدرێن. ناچار بووم پەنجەرەکان دابخەمو "کاری"یش چەند دەفرێکی هێنا کە لەژێر دڵۆپەی هەیوانەکەدا دایبنێ.

لەگەڵ ئەوەی ویستم دیسانەوە پێنووسەکەم بەدەستەوە بگرم، وەبیرم هاتەوە باڵنجێك، رایەخێکی بچووك، کڵاوەکەمو هونراوەکانی "ماتیو ئارنۆڵد"م لەژێر دارەکاندا داناوە. بە هەڵاتن چوومو هێنامنەوە ژووری. بەڵام هەموو تەڕ ببوون. رەنگی سووری روویەرگی کتێبەکە هەموو لاپەڕەکانی سوور کردبوو. لێزمە بارانی گوند بەڵایەکی گەورەیە. مرۆڤ دەبێ هەر شتێکی لە دەرەوە داناوە لەبیری نەچێ ئەگینا خراپ دەبن.

پێنجشەممە

بابە! بابە! پێت وایە چی رووی داوە؟ هەر ئێستا پۆستچی دوو نامەی بۆ هێنام. یەکەم، چیرۆکێك کە بۆ گۆڤارم ناردبوو پەسند کراوە. پەنجا دۆلار ... فەرموو. من بوومە نووسەر.

دووهەم، نامەیەکم لە نووسینگەی زانکۆوە بۆ هاتووە. تێیدا نووسراوە کە یارمەتی خەرجی دوو ساڵەی خوێندکاری وەبەر من کەوتووە. ئەو پارەیە خەرجی خوێندنو پانسیۆنم دابین دەکا.

بڕیار وابوو ئەو یارمەتییە بە خوێندکارێك بدرێ کە لە دەرسی زمانی ئینگلیسیدا لە پلەیەکی زۆر بەرزدا بێو لە دەرسەکانی دیکەشدا خوێندکارێکی باش بێ. ئێستا من ئەو خەڵاتەم بەدەست هێناوە.

پێش ئەوەی بڕۆم بۆ ئیلاخ داوخواستی ئەوەم کردبوو، بەڵام بەهۆی دەرنەچوونمەوە لە دەرسەکانی ئەندازیاریو لاتین لە ساڵی یەکەمدا، بیرم نەدەکردەوە سەرکەوتنێکی ئاوا بەدەست بێنم. بایەگیان ئەم هەواڵە زۆری خۆشحاڵ کردم، چونکە لە ئێستە بەدوا زەحمەتم بەسەر تۆوە کەم دەکاتەوەو هەر ئەو پوولگیرفانییە بۆ من بەسە. لەوانەیە بە وانە گوتنەوەو چیرۆکنووسی،

پوولگیرفانیەکەش دابین بکەم.

بۆ زانکۆو دەست پێکردنەوەی خوێندن لەوانەیە باڵ بگرمەوە.

بچووکی هەتا هەتایی تۆ

جیرۆشا ئابۆت

نووسەری چیرۆکی "ئەو کاتەی ساڵی دوویەمی یەکان سەرکەوتوو دەبن".

شوێنی فرۆشتن: هەموو رۆژنامە فرۆشیەکان

## ۲ی سێپتامبر

## بابه لاق درێژی خۆشەویست

دیسان گەڕامەوە بۆ زانکۆ. بەو جیاوازییە کە دەچمە کەلاسێکی سەرەوەتر. ئەمساڵ ژووری خوێندنەوەمان لە ساڵانی پێشوو باشترە. رووی لە باشوورەو دوو پەنجەرەی گەورەی هەیە. چ موبلو کەلوپەلێك!! "جولیا" بەو پوولگیرفانییە بێحیسابەیەوە دوو رۆژ پێشتر گەیوەتەوە. هەموو شوێنێکی رێكو پێك کردووە. کاغەز دیوارییەکان نوێ بوونەوە. فەرشەکان کری رۆژهەلاتن. سەندەڵییەکان لە داری مارغوونن. نەك وەکوو ساڵی پار کە دارەکانمان بە رەنگ کردن بە شێوەی داری مارغوون دەرهێنابووو وزۆریش پێی خۆشحاڵ بووین. بەڵکوو دارماغوونی راستەقینەو زۆریش بەشکۆیە. وا هەست دەکەم من بۆ ئەم شوێنە نابمو ئێرە جێگای من نیە. هەمیشە لە نیگەرانیدام دەترسێم شوێنێك لە ژوورەکە جەوهەری پێدا برژێو پەڵەی بکەوێتە سەر.

بابە! لە گەڕانەوەمدا نامەی تۆ ـ ببوورە "نامەی سکرتێرەکەی تۆم" زیارەت کرد. تکایە بفەرموو بۆچی دەبێ یارمەتیی خوێندکاری قبووڵ نەکەم. من لەهۆی دژایەتیی تۆ تێناگەم. لە هەرحاڵدا ناڕازی بوونی تۆ چووکترین کەلکێکی نیە. لەوانەیە ئەم جۆرە قسانەم بە ئیهانەت لێك بدەیتەوە، بەلام من هیچکات ئەو نیەتەم نیە.

رەنگە لەبەر ئەوەی ئەرکێکت خستۆتە سەر شانی خۆت، پێت خۆش بێ ئەو ئەرکەت تا کۆتایی درێژەی هەبێ. لە هەرحاڵدا من ئەم پەروەردەو فێربوونەم لە

تۆوە دەزانمو قەرزدارتمو ڕاست وەك ئەوەیە تا دواکات خەرجی منت دابێ. بەڵام ئەگەر من ئەو یارمەتییە قبووڵ بکەم لەوانەیە بارگرانیی قەرزەکەم کەم بێتەوە. دەزانم تۆ پێت خۆش نیە ئەو قەرزانە بدەمەوە، بەڵام من بە نۆبەی خۆم ئەگەر بتوانم دەمەوێ ئەو کارە بکەمو قبووڵ کردنی ئەو یارمەتییە لە قورسایی سەر شانی من هەندێك کەم دەکاتەوە. پێم وابوو کە درێژایی تەمەنم لەگەڵ قەرزدانەوەدا ڕادەبرێ، بەڵام بە قبووڵ کردنی ئەم یارمەتیی خوێندکارییە وەك ئەوەیە نیوەی قەرزەکانم دابێتەوە.

هیوادارم وەزعی من لەبەرچاو بگریو بەخوات سوێند دەدەم لێم زیز نەبی. دیارە پوڵگیرفانیەکە، وێڕای یەك دنیا سپاس قبووڵ دەکەم. چونکە پێم خۆشە وەکوو "جولیا" بژیم بۆ ئەوەی لە بەرامبەریدا کەم نەهێنم، پێویستم بەو پارە هەیە. بریا بە خواستو سەلیقەیەکی ساکارتر "جولیا"یان پەروەردە کردبا، یان لانیکەم لەگەڵ من لە ژوورێکدا نەدەبوو.

نابێ ئەم نامەیە وەك نامەیەکی دروستو ڕێكو پێك حیسابی بۆ بکرێ. دەمویست نامەیەکی دوورو درێژ بنووسم. بەڵام من چواردە پەردەو سێ پشتدەریم دروو (خۆشحاڵم لەوەی ئەو تەقەڵە گەورانە نابینی). دەزگایەکی ئامرازی نووسینم بە پۆدرو فلچەی ددان خاوێن کردۆتەوە، چوارچێوەی قاپی وێنەکانم بە بڕەنی مانیکۆر سڕیوەتەوە، چوار بەستە کتێبو دوو چەمەدان جلوبەرگم پێچاوەتەوەو هەندێ جلی دیکەم بەشوێنی خۆیاندا هەڵواسیوە (جێگای بڕوا نیە "جیرۆشا ئابۆت" پڕی دوو چەمەدان جلوبەرگی هەبێ، بەڵام ئەوە ڕاستە)و وێڕای ئەوانە میواندارییم لە پەنجا کەس لە هاوڕێیانی خۆشەویستی خۆم کردووە.

ڕۆژی کردنەوەی زانکۆ لە ڕۆژە خۆشەکانی ئێمەیە. شەو باش بابە گیان.

لەوەی کە جووجەڵەکەت دەیەوێ لەسەر پێی خۆی راوەستێ دڵگران نەبی. وا دیارە ئەم جووجەڵە بچکۆلە خەریکە پڵو پۆ دەردێنێ، گەورە دەبێ، وەك مامرێکی بەهێزو بەجارو جەنجاڵ لە کڵ دەردێ، بەوپەڕی ورەوە دەگارکێنێ و یەکدنیا پەلوپۆی جوانی هەیە. دیارە ئەمانەم بە لوتفی تۆ بەدەست هێناوە.

## ٢٠ی سێپتامبر

بابەی ئازیز! پەشتا لە مەسەلەی یارمەتیی خوێندکاری دەستت هەڵنەگرتووە؟ من تا ئێستا پیاوێکی بەوڕادەیە خودڕەئی، یەکقسەو بێمەنتقم نەدیوە. کەسێك کە ناتوانێ‌لە دەلاقەی چاوی کەسانی دیکەوە شت ببینێ.

تۆ پێت خۆش نیە بچمە ژێر باری منەتی بێگانانەوە؟ بێگانان! ئایا خۆت بۆ من بێگانە نی؟ داخوا لەم جیهانەدا کەسێك هەیە کە لە تۆ کەمتری بناسم؟ من ئەگەر لەسەر جادە بتبینم ناتناسم.

لانیکەم ئەگەر تۆ پیاوێکی روناکبین دەبووی‌و نامەی خۆشەویستی‌و شادیبەخشت بۆ "جودی" بچکۆلە دەنووسی‌و جاروبار بۆ دیتنی دەهاتی دەستێکی پڕ لە میهرەبانی‌و نەوازشت بەسەری‌دا دێناو دەتگوت لەوەی کە کچێکی باشت هەیە خۆشحاڵی، لەوانەبوو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو تەمەنە زۆرەی کە هەتە، منیش سەرەڕۆیی‌و کەڵەوەکیشیم نەکردباو سەرم بۆ فەرمانەکانت نەوی کردبا.

بێگانەکان! جەنابی "ئیسمیت" تۆ لە ژووری ئاوێنە بەندا دەژی؟

بێجگە لە هەموو ئەوانە ئەو یارمەتی‌و خەرجی خوێندکارییەکانتان کە لە لایەن زانکۆوە بە منی دەدەن، خێرو سەدەقە نیە، بەڵکوو خەڵاتێکە کە بەهۆی هەوڵ‌و تێکۆشانم لە وانەکانمدا بەدەستم هێناوە. ئەگەر کەسێك لە وانەی ئینگلیسی‌دا پلەی بەرز بەدەست نەهێنێ، زانکۆ ئەو یارمەتی‌و خەرجی خوێندکاریەی ناداتێ. ئەو نەریتە لەمێژە بەڕێوە دەچێ. لە هەرحاڵدا (باسکردن

لەگەڵ کەسێك کە مەنتیق ناسەلمێنێ بێکەڵکە) جەنابی ئیسمیت: تۆ لەو کەسانەی کە هەرگیز بەڵگەو دەلیل قبووڵ ناکەن. بۆ ئەوە کەسێکی ئاوەهایی بهێنیتە سەر ڕێگای ڕاست، دوو ڕێگا هەیە. یا دەبێ تیتاڵی پێ بکەی، یان لەگەڵی بەدخولق بی. چونکە من بۆ گەیشتن بە ئامانج نامهەوێ تیتاڵی بە کەسێ بکەم، ناچارم ڕێگای دوویەم هەڵبژێرم.

جەناب: من بە هیچ کلۆجێ ئامادە نیم ئەو یارمەتییەی زانکۆ لەدەست بدەمو ئەگەر لەوە زیاتر هەروا هەنگامە وەڕێبخەی لەمەولا پوڵگیرفانیەکەشت لێ قبووڵ ناکەمو ئەوەندە دەرس بە ساڵی یەکەمەکان دەڵێمەوە تا وەك دەرزی باریك دەبم. ئەمە دوایین وتەی منە.

پێشنیارێکم هەیە. تکات لێدەکەم گوێم لێڕاگرە. ئەگەر پێت وایە قبووڵ کردنی ئەو یارمەتییە لە لایەن منەوە دەبێ بەهۆی زایە بوونی مافی خوێندکارێکی دیکە، ڕێگا چارە ئەوەیە کە ئەو پارەی لە من خەرجی دەکەی، لە پەروەردو ڕاهێنانی کچۆڵەیەکی دیکەی هەتیوخانەی "جان گریر"دا سەرفی بکە: فکرێکی باش نیە؟

بابە گیان! هەرچۆنت پێخۆشە بەو کچۆڵەیە کە پێشنیارم پێکردووی یارمەتی بکە، بەڵام بەخوات سوێند دەدەم لە من زیاترت خۆش نەوێ.

دڵگیر مەبە لەوەی گوێڕایەڵی ئەو پێشنیارە نیم کە لە نامەی سکرتێرەکەتەوە پێم دەگا. زۆر بە داخەوەم بەڵام کارێکی دیکەم لەدەست نایە.

تا ئێستا هەموو پێشنیارەکانم بەدڵ ئەنجام داوە، ئەمجارە لە ناخی دڵەوە بڕیارم داوە بە ورەیەکی بەرزەوە دەچمە پێش.

لەگەڵ بڕیارێکی بەهێزو ئیرادەیەکی پۆڵایین

"جیرۆشا ئابۆت"

## ٩ی نوامبر

## بابه لاق درێژی خۆشەویست

ئەمڕۆ ویستم بچم بۆ شارو شیشەیەك بۆیەی ڕەش، چەند یەخە كراس، قوماشێك بۆ بلووز، شیشەیەك كرێمی وەنەوشەو سەلكێك سابوون (كە زۆرم پێویستن‌و ڕۆژێك بێ ئەوانە هەڵناكەم) بكڕم. ڕاست كاتێك ویستم پارە بە شۆفێر بدەم، دیتم كیفی پارەكەم لە گیرفانی جاگەتەكەی دیكەمدا بەجێ هێشتووە. ناچار دابەزیم‌و بە ئوتووبووسی دواتر چووم بۆ شار. چەندە جێی داخە مرۆڤ پارەی كەم بێ‌و جاكەتی زۆر!

"جولیا" بانگێهشتی كردووم كە بۆ پشووی كریسمەس بچم بۆ لای ئەو. پێت چۆنە جەنابی "ئیسمیت". بیهێنە بەرچاوی خۆت "جیرۆشا ئابۆت"ی هەتیوخانەی "جان گریر" لەسەر مێزی دەوڵەمەندان دابنیشێ! نازانم "جولیا" بۆچی لێی گێراومەوە. ڕەنگی لەم دواییانەدا ئۆگرم بووبێ. ئەگەر ڕاستت دەوێ بەلامەوە باشترە بڕۆم بۆ لای "سالی" بەڵام "جولیا" پێشتر بانگهێشتی كردووم. كەوابوو ئەگەر ویستم بڕۆم بۆ شوێنێك ئەو شوێنە نیویورك دەبێ نەك "وورسیستر".

من دەترسێم لەگەڵ بنەماڵەی "پندلتون" ڕووبەڕوو بم. بێجگە لەوەش دەبێ چەند دەست جلوبەرگی نوێ بكڕم. كەوابوو ئەگەر بۆم بنووسی كە پێت خۆشە هەر لە زانكۆ بمێنمەوە، لە بەرامبەر ئەو ئەمرەتدا سەری كڕنۆش دادەنەوێنم‌و سپاست لێ ئەگەم.

لەکاتی بێکاری‌دا نامەکان‌و چۆنیەتیی ژیانی "توماس هاکسلی"[1] دەخوێنمەوە. سەرنج راکێشە. ئایا دەزانیت "ئارکئوپتریکس"[2] چیە؟ پەلەوەرێکە! یان دەزانی "ئیستریئوگناتوس"[3] چیە؟ خۆشم بە باشی نازانم. بەلام وای بۆ دەچم ئالقەی ون (حلقه مفقوده) بێ. یان مەلێك کە ددانی هەبێ یان مارمێلکەی باڵدار. بەلام نا. هیچ کام لەوانە نیە، ئێستا تماشای کتێبم کرد. بوونەوەرێکی مەمك داری دەورەی "مزوزوئیك"ـە.

ئەمساڵ زانستی ئابووری دەخوێنین. باسەکانی جێگای سەرنجن. کاتێك وانەکانمان تەواو کرد دەمەوێ کاری خێرخوازی‌و یارمەتیدان‌و چاکسازیی کۆمەلایەتی هەلبژێرم. جەنابی یارمەتیدەر! ئەوکات بە باشی دەزانم کە هەتیوخانە چۆن دەبێ بەڕێوە ببرێ. بڕوا بکە ئەگەر بتوانییا لە دەنگداندا بەشداری بکەم دەمزانی کێ هەلبژێرم. حەوتووی رابووردوو کۆتایی ٢١ ساڵی تەمەنم بوو. چ ولاتێکی بێکەلك‌و خراپە. کەسانی خوێندەوار‌و خاوەن مرخ‌و شایستەی وەك من هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ.

دۆستی هەتاهەتاییت

"جودی"

---

[1] Thomas Haxley
[2] Arehaeopteryx
[3] stereognathus

## ٧ی دیسامبر

## بابە لاق درێژی خۆشەویست

لەوەی رێگات دام بچم بۆ لای "جولیا" زۆرت سپاس دەکەم. بێدەنگیی تۆم وەك وەڵامی ئەرێنی چاو لێکرد.

کارە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە لەم رۆژانەدا زۆرن. رێورەسمی سەمای دەستەی دامەزرێنەران حەوتووی رابووردوو بەرێوە چوو. ئەمە بۆ یەکەم جار بوو کە ئێمە بۆمان هەبوو لەو میوانییەدا بەشداری بکەین.، چونکە تەنیا خوێندکارانی کەلاسەکانی سەرەوە دەتوانن بەشدار بن.

من "جیمی مەك براید"م بانگهێشت کردو "سالی"ش هاوڕێوورەکەی "جیمی" دەعوەت کرد، ئەو گەنجەی سالی پار لە ئۆردوو پێکەوە بووین. کەسێکی زۆر سەرنجڕاکێش نەبوو، بەڵام لەبارەی پلەو پایەی کۆمەڵایەتییەوە عەیبی نەبوو. ئەو سەر بە خانەدانی "دیلامیتر چیستر"[1] ـەکانە. رەنگە تۆ شتێك لەو ناوە بزانی بەڵام من تێی ناگەم.

لە هەرحاڵدا، میوانەکانی ئێمە پاشنیوەڕۆی رۆژی هەینی هاتن. چاییمان لە سەرسەرای بینای سالی چوارەمەکەمان دا خواردەوە. بۆ خواردنی شێو چوونە هوتێل. هوتێل بەرادەیەك قەرەباڵغ بوو کە دەیانگوت میوانەکانی زانکۆ لەسەر مێزی بیلیارد، پاڵیان پێکەوە دابوو نووستبوون. "جیمی مەك براید" دەیگوت ئەگەر جارێکی دی بۆ ئەم زانکۆیە دەعوەت بکرێ، یەکێك لە خێوەتەکانی

---

[1] Delamater Chiester

خۆیان دێنیّ و لەنێو باخی زانستگەدا هەڵی دەدا.

میوانەکان کاتژمێر ٧:٣٠ خولەکی هەر ئەو ڕۆژە لە جێژنێکدا کە لە لایەن زانکۆوە ساز درابوو بەشداریان کرد (بەرنامەکانی ئێمە زۆر جاران زوو دەست پێ دەکا). ئێمە پێشتر کارتی پیاوەکانمان بەڕیز هەڵواسیبوو. پاش هەر سەمایەك بڕیار بوو هەر کەس لەژێر پیتی یەکەمی ناوی خۆی ڕاوەستێ، کە کچەکان بتوانن بە ئاسانی لف[1]ـەکەی خۆیان بدۆزنەوە. بۆ نموونە "جیمی مەك براید" لەژێر پیتی "م"دا ڕادەوەستا. بەڵام ئەو بەسەر پێوە خۆی ڕانەدەگرت و زۆر جار لەگەڵ پیتەکانی "ر"، "سین"و "لام"دا تێکەڵ دەبووو (ئەو وەك میوانێکی ناعال بەحیساب دەهات) زۆر بە گران دەمتوانی زەوتی بکەم. لەوەی کە تەنیا سێ جار لەگەڵ من سەمای کردبوو، لووتی لێ کردبووم و نارەحەت بوو. دەیگوت: من شەرم دەکەم لەگەڵ کچانێك کە نایانناسم سەما بکەم.

بەیانیی ڕۆژی دوایی لە "یانەی شادمانی" کونسێرتێك بەڕێوە چوو. دەزانی سروودی فوکاهیی کونسێرتەکە کێ ئامادەی کردبوو؟ ... بڕوا بفەرموو "خۆیەتی". بەڵێ. من. بابەگیان ئەو منداڵە بچکۆلە بێ دایك و بابەی تۆ خەریکە لە کڵ دەربێ و ببێ بە کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو. لە هەرحاڵدا دوو ڕۆژی زۆر خۆشمان لێبڕا برد. پێم وایە هەم لە ئێمە خۆش ڕابرد و هەم لە پیاوەکان. چەند کەس لەوان لەوەی کە لە پڕێکدا لەگەڵ هەزار کچ بەرەوڕوو ببوون حەپەسابوون. بەڵام زۆر زوو بە شوێنەکەدا ڕاهاتن. دوو میوانەکەی زانکۆی "پرنستن"ی ئێمەش زۆر خۆشیان لێبڕا برد، یان لانیکەم زۆر بە ئەدەبەوە دەیانگوت خۆشیان لێبڕا بردووە. ئێمەیان بۆ بەرنامەی سەمای خۆیان لە ساڵی داهاتوودا دەعوەت کرد و

---

[1] لف: هەڤاڵ، ڕەفیق، دۆس

ئێمەش قبوولّمان کرد. تکات لیّ دەکەم رێگام لیّ مەگرە.

منو "جولیا"و "سالی" هەرسێکمان جلوبەرگی نوێمان کڕیبوو. پێت خۆشە بزانی جلەکانمان چۆن بوون؟ جلی "جولیا" قوماش ساتێنی کرێمی بوو کە بە دەزووی تەلاّیی گولّدۆزی کرابووو گولّێکی بەنەوشیشی دابوو لەسەری. جلوبەرگێکی لەرادەبەدەر جوان بوو. رایسپاردبوو لە پاریسەوە بۆیان ناردبوو. لەوانەیە بایی یەك میلیۆن دۆلار بێ. جلەکانی "سالی" قاوەیی کالّ بوو کە بە شێوازی ئێرانی گولّدۆزی کرابوو لەگەلّ قژە سوورەکەی‌دا هاوئاهەنگ بووو باشی لیّ دەکالاّیەوە. دیارە وەك جلەکانی "جولیا" بەگران تەواو نەبووبوون، بەلاّم هەر بەو ئەندازەیە جوان بوو. جلەکانی منیش لە کریپدوشینی چێرەیی کەمرەنگ بوو کە بە تۆڕو ساتینی پەمەیی تۆخ رازێندرابۆوە. چەپکە گولّێکی سووری گەورە کە "جیمی مەك براید" بۆی ناردبووم بەدەستمە بوو (سالی بە ئەوی گوتبوو کامە رەنگ هەلّبژێریّ). کەوشی هەرسێکمان لە ساتین‌و گۆرەویەکانمان ئاوریشم بوو. بەپێی رێککەوتن لەگەلّ رەنگی جلەکانمان هەر یەکە دەستمالّێکی دووگرد[1]مان دابوو بەسەر شانماندا. بێگومان لەم هەموو تاریف‌و پێدا هەلّگوتنە سەرت سوور دەمێنیّ.

مرۆڤ جاروبار بیر دەکاتەوە کە ژیانی پیاوان چەندە ساردو بێڕەنگ‌و بۆریە. چونکە بۆ پیاوان وشەگەلی تۆڕی، گولّکاری، مەلیلەکاری‌و شتی لەو چەشنە هیچ مانایەکی نیە. بەلاّم ژن بۆ هەموو شت، منداڵ، میکرۆب، مێرد، هۆنراوە، کولّفەت، گولّکاری، ئیفلاتوون، یاریی بریج‌و بە کورتی هەموو شتێکی وەك

---

[1] دووگرد: دەستمالّی هەوری رەنگامە. دیارە بە جاجمیش دەگوتریّ بەلاّم لێرەدا مەبەست هەوریی رەنگامەیە.

ئەوانەو بەتایبەت جلوبەرگ‌و جوانکاری‌و کەشمونەشمدا پەیوەندییەکی توندو تۆڵی هەیەو ئێرگریانە. ئەمە یەکێك لە یارییەکانی سروشتە کە هەموو بەش‌و دیاردەکانی ئەم جیهانە لێك نزیك دەکاتەوەو دەیانکا بە خزم.

لەوانە بگەڕێین. پێت خۆشە لە نهێنییەکی تازە پێمزانیوە ئاگادارت بکەم؟ باشە با پێت بڵێم کە: من کچێکی جوانم!

لەگەڵ ئەوە کە سێ ئاوێنە لە ژوورەکەم دایە، زۆر گێل بووم کە تا ئێستا بەو شتەم نەزانیبوو.

- یەك هاورێ

پاشکۆ:

ئەم نامە وەك نامەی چیرۆکەکان دەچێ بۆیە واژۆی نیە.

**٢٠ی سێپتامبر**

تەنیا یەك خولەك کاتم هەیە چونکو ئێستا دەبێ لە ژووری دەرسخوێندن ئامادە بم. پاشانیش دەبێ دوو چەمەدان‌و سندووقێك وەپێچم‌و کاتژمێر ٤ بە سواری شەمەندەفەر وەڕێکەوم. بەڵام تا چەند وشەیەك بۆ تۆ نەنووسم‌و لەبارەی دیاریی ڕۆژی کریسمەسەوە کە بۆت ناردبووم سپاست لێ نەکەم، ناتوانم بڕۆم. دیارە من پێستی ڕێوی، گەردانە، ملپێچ، دەستماڵ‌و کتێب‌و ئەو جۆرە شتانەم پێخۆشە، هەمبێ، بەڵام زیاتر لە هەموو ئەوانە تۆم خۆش دەوێ. بابە گیان! نابێ ئەوەندە نازم بدەیتێ. من مرۆڤم، ئەویش یەك کچ. کاتێك ئەوەندە لەگەڵ خۆشییەکانی ژیاندا ڕامبهێنی، چۆن دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بی بتوانم بە وردبینی‌و سەرنجەوە خۆم بۆ ژیانی داهاتووم ئامادە بکەم.

ئەم کارانەی تۆ منی خستە نێو بیرکردنەوەو، ئێستا هەست دەکەم ئەو کەسە کۆیە بەستەنی ڕۆژانی یەکشەمەو داری جێژنی کریسمەسی بۆ ڕێکخراوی "جان گریر" دەنارد، هەرچەند ئەو کەسە بۆ ئێمە نەناسراو بوو، بەڵام بەهۆی کارەکانیانەوە وێدەچێ بیناسم. بەو خودایە، بەم هەموو کارە خێرانەی کە ئەنجامی دەدەی، مافی خۆتە بە درێژایی تەمەنت خۆش‌و شادو لەشساخ بی.

خوات لەگەڵ... جەژنت پیرۆز

بچووکی هەتا هەتاییت

جودی"

پاشکۆی ئەم نامە:

دەمەوێ یادگارێکی کەم بایەخت بۆ بنێرم. داخوا خاوەنی ئەم وێنەیە

دەناسی؟

## ١١ی ژانویە

دەمویست لە نیویورکەوەنامەت بۆ بنووسم، بەڵام نیویورک مرۆڤ لە خۆیدا نوقوم دەکا. لە هەر بابەتێکەوە زۆر خۆشم لێرابووەرد. لەگەڵ ئەوەش خۆشحاڵم کە ئەندامی ئاوەها بنەماڵەیەك نیم. ئێستا دەزانم گیرۆدەبوون بە پارەو سامان چ مانایەکی هەیە. ژیانی مادیی ماڵی "پندلتون" مرۆڤ وردو خاش دەکا. کاتێك توانیم هەناسەیەك بە ئاسوودەیی هەڵکێشم، کە بۆ گەڕانەوە سواری شەمەندەفەر بووم. موبلەکان هەموو کەندەکاریو رووپۆش دار بوون. ئەو کەسانەی لەوێم دەدیتن هەموو تەرپۆش بوونو بە ئەدەبەوەو بە هێواشی دەدوان.

بەڵام بابە گیان! راستیەکەی ئەوەیە لەو کاتەوە چوومە ئەوێ تا وەختی گەڕانەوەم تاکە وشەیەکی بەکەڵکم نەبیست. پێم وایە بیرکردنەوەو داهێنەری هیچکات بەلای ماڵی ئەواندا نەچووە. خاتوو "پندلتون" بەدایم بیری لەلای جەواهیرات، بەرگدروو، گیروگرفتی کۆمەڵایەتیو دیدارو دیدار بینییەکانیدا بوو. ئەم دایکە لەگەڵ دایکی "سالی" زۆر لە یەکتر جیاوازن. ئەگەر من شوو بکەمو بنەماڵە پێك بێنم، پێم خۆشە وەك بنەماڵەی "مەك برایەد" بم. بە هیچ شێوەیەك پێم خۆش نیە مندالەکانم وەك "پندلتون"ـەکان پەروەردە بن.

رەنگە باش نەبێ ئینسان میوانی کەسێك بێو خراپەی خاوەنماڵ بڵێ. ئەگەر وا بیر دەکەیەوە داوای لێبووردنت لێ دەکەم. ئەم قسانە تەنیا لە بەینی منو تۆدایە.

بەڕێز "جروی"م تەنیا جارێك بینی ئەویش کاتی چایی خواردنەوە. تەنانەت

یەك لەحزەش نەمتوانی لەگەڵی بدوێم. ئەمەش دوای ئەو دۆستایەتییە گەرمەی کە هاوین لە نێوانماندا پێك هاتبوو، زۆر جێگای بێزاریم بوو. پێم وایە پەیوەندی ئەو لەگەڵ خزمەکانی زۆر باش نەبێ. ئەوانیش "جروی"یان خۆش ناوێ.

دایکی "جولیا" پێی وایە بەڕێز "جروی" سوسیالیستە، بەڵام بە خۆشییەوە نە کراواتی سووری هەیەو نە قژە سەریشی درێژە. بنەماڵەی "پندلتون" لایەنگری کلیسای ئینگلیستانن‌و دایکی "جولیا" سەری لەوە سووڕ ماوە کە ئەم بیروبارەڕە سەیرە چۆن لە مێشکی "جروی"دا جێگای خۆی کردۆتەوە. چۆنە بەڕێز "جروی" لەباتیی ئەوە پارەی خۆی لە ڕێگای ژیرانەی وەك کڕینی لۆتکە، ماشین یان ئەسپی جلیت بازیدا سەرف بکا، دەچێ لە ڕێگای چاکسازیی گەوجانەوە بەبای دەدا.

هەرچۆنێك بێ شیرینی‌و شوکولاتی باش درووست دەکا! چونکە بۆ من‌و "جولیا" هەر یەکەوو قوتوویەکی بۆ ناردووین.

دەزانی لەوانەیە منیش ببم بە سوسیالیست. تۆ کە دژایەتیم ناکەی؟ سوسیالیستەکان لەگەڵ توندئاژۆکان جیاوازن. لانیکەم ئەمان بڕوایان بەوە نیە کە دەبێ خەڵك بە بۆمبا لەتوکوت بکرێ. ڕەنگە باشتر بێ لەگەڵ "پرولتاریا" بم. ڕاستییەکەی ئەوەیە یەشتا بڕیاری تەواوم نەداوە کە لایەنگری کامە گرووپ بم. لەو بارەوە بیر دەکەمەوەو ڕۆژی شەممە لە نامەی دواتردا ئاکامەکەیت بۆ دەنووسم.

من هەموو تیناترەکان، هوتێلەکان‌و زۆرتری دووکانەکانم تەماشا کرد. ئێستا مێشکی من پڕ لە ئاقیق، ئاوی تەلاکاری‌و موزاییکە. لە دیتنی ئەو هەموو کەلوپەلە چاوەکانم "مۆلەقن"، بەڵام خۆشحاڵم کە گەڕاومەتەوە بۆ زانکۆو لەگەڵ کتێبەکانمدام.

لەوە دەچێ ئێستا من خوێنەرێکی بەڕاستی بم. ئەم شوێنە ئارام و "فەرهەنگی"یەی زانکۆ لام زۆر سەرنجڕاکێشترە لە نیویۆرک. کتێب، دەرس و ژوورە ڕێکوپێکەکانی، بیرو هزری مرۆڤ وەخەبەر دێنن. هەر کاتێکیش مێشک ماندوو بوو، ژیمناستیك و وەرزشەکانی دیکە لە هەوای ئازاددا و هەروەها هاوڕێ یەکرەنگەکان، کە هەموو وەك یەك بیر دەکەنەوەو بە هەست و خواستی یەکتر ئاگادارن، مرۆڤ ئاسوودە دەکەن.

هەندێ شەو لەگەڵ هاوڕێیان لە دەوری یەك کۆ دەبینەوە لەگەڵ یەك دەدوێین، دەدوێن و دیسان دەدوێین. وەك ئەوە گرێی هەموو مەسەلەکانی جیهانمان کردبێتەوە، بە دڵێکی رازیو شادەوە دەنووین. جاروبارێش لە تێچینی باسەکانماندا دوو شۆخیو گاڵتەجاڕی زیاتر خۆشحاڵمان دەکا. ئێمە قەدری ئەم کاتانە زۆر بە باشی دەزانین.

شۆخییە گەورەکان گرینگ نین. گرینگ ئەوەیە پیاو بتوانێ بە باسێکی بچووك خۆشحاڵ بێ.

بابەگیان! من هێمای خۆشەویستیم دۆزیوەتەوە. ئەویش ئەوەیە کە بۆ ئێستا بژیت. خەفەت بۆ رابووردوو خواردن و چاوەڕوانی پێشەرۆژبوون، هەڵەیەو دەبێ لەم لەحزەیە کەڵك وەرگری.

من دەمەوێ لە هەموو چرکەیەکی ژیانمدا خۆش و شاد بم هەست بەو خۆشیو شادییە بکەم. هەندێ کەس ژیان ناکەن، بەڵکوو لە کێبەرکێی هەڵاتن دان. دەیانەوێ بە ئامانجێك کە لە ئاسۆیەکی دوورە دەستدایە بگەن. لە حاڵێکدا هەناسەبڕکێیان پێکەوتووە دیسان هەڵدێن و ئاگاداری جوانییەکانی دەوروبەریان نین، تا کاتێك پیرو لاکەوتە دەبن و ئیتر گەیشتن یان نەگەیشتن بە ئامانج بۆیان بێجیاوازییە.

بەڵام من بڕیارم داوە، ئەگەر ببم یان نەشبم بە نووسەرێکی گەورە، لەسەر ڕێگا دابنیشمو کۆگایەك لە خۆشییەکانی ژیان پاشەکەوت بخەم. دەبینی چ فیلسووفێکم لێ دەر هاتووە؟

ئەو کەسەی هەتایە خۆشی دەوێ

"جودی"

پەراوێز:

ئەمشەو بەجێی باران سەگو پشیلە دەباری. دوو تووتکە سەگو بێچووە پشیلەیەك کەوتوونەتە لێواری پەنجەرەکە.

**هاوڕێی خۆشەویست**

**بەڵێ! من ئێستا "فابیان"م.**

فابیان سوسیالیستێکە کە دەبێ میانەڕەوو بە تەحەمول بێ. ئێمە ناسانەوێ هەر سبەینێ شۆڕشی سوسیالیستی روو بدا (چونکە دەبێ بەهۆی جارز بوونی خەڵك). بەڵکوو دەمانەوێ لە داهاتوو هێدی هێدی، کاتێك کە هەموومان ئامادەی ئەو کارە بین‌و بتوانین قبووڵی بکەین، روو بدا. تا ئەو کاتە ئێمە دەبێ بە کاری چاکسازیی وەك دروستکردنی هەتیوخانە، پەروەردەو فێرکردن، پیشەسازی، فەرهەنگی‌و راهێنانەوە خەریك بین‌و خۆمان بۆ سەردەمی شۆڕش ئامادە بکەین.

لەگەڵ خۆشەویستی هاوڕێیانە

"جودی"، زەنگی سێهەم

## ١١ی فەوریە

پێت ناخۆش نەبێ کە ئەم نامە زۆر کورتە. نامە نیە. تەنیا چەند دێڕێکە بۆ ئەوەی پێت بڵێم بەم زووانە، کاتێك تاقیکردنەوەکان کۆتاییيان پێ هات نامەت بۆ دەنووسم. بۆ من ئەوەندە بەس نیە کە لە تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوم. بەڵکوو دەبێ بە نمرەی باشەوە قبووڵ ببم کە شیاوی یارمەتییەکەی زانکۆ بم.

ئەو کەسەی بەوپەڕی توانایی خەریکی ئامادەکردنی دەرسە

"جودی"

**٥ی مارس**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

ئەمڕۆ سەرۆکی زانکۆ بەڕێز "کویلیر"[1] لەبارەی بەرەی نوێوە کە زۆر ڕواڵەتی و بێپەروان، کونفرانسی هەبوو. دەیگوت: ئێمە بڕوای جارانی خوێندکاری، کە بریتی بوو لە "تێکۆشان"و "جیددی" بوون، لەدەستمان داوە. ئەو شتە بەتایبەت لە هەڵسوکەوتی خوێندکاران سەبارەت بە کەسانی سەرەوەتردا، بەڕوونی دەردەکەوێ. خوێندکاران ئەو ڕێزە لە مامۆستایان ناگرن کە شیاوی ئەوانە.

من لە حاڵێکدا لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بووم، لە کلیسا هاتمە دەرەوە، بیرم لەوە دەکردەوە داخوا سەبارەت بە تۆ زۆر بێپەرواو بێ ئەدەبم؟ پێت وایە ڕەفتاری من دەبێ "جیددی"تر بێ؟

بەڵێ. دڵنیام دەبێ بەو شێوەیە بێ. کەوابوو لە نوێوە دەست پێدەکەم.

---

[1] Cuyler

## بەڕێز "ئیسمیت"ی خۆشەویست

پێموایە خۆشحاڵ دەبی بزانی تاقیکردنەوەکانم سەرکەوتووانە کۆتایی پێ هێناوەو دەورەیەکی سێمانگەی نوێم دەست پێکردووە. واتە جوێکردنەوەو لێکدانو (تجزیە و ترکیب)و شیمیم تەواو کردووەو دەستم کردووە بە ئامادەکردنی "ژیننناسی" (بیولوژی). دیارە بە هەندێك دوو دڵییەوە لەم وانە نوێیە نزیك دەبمەوە چونکە وادیارە دەبێ جەستەی بۆقێك لێك جوێ بکەمەوە، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەمو وتاری لەسەر بدەم (تشریح).

حەوتووی رابووردوو لە کلیسا کونفرانسێکی سەرنجڕاکێش لە بواری شوێنەواری جێماو لە شارستانیەتی رۆمییەکان لە باشووری فرانسە بەڕێوەچوو. تا ئێستا شتێکی وا سەرنجڕاکێشم نەبیستبوو.

ئێمە لە دەرسی زمانی ئینگلیسیدا چامەی "نوێژگەی تین تین"[1]، لە نووسینی "ووردزوورس"[2] دەخوێنین. شتێکی زۆر جێگای سەرنجەو چەند جوان بۆچوونی خۆی لەبارەی "وجوودی تاکانە"وە روون کردۆتەوە.

بزووتنەوەی "رۆمانتیسم" کە لە کۆتایی سەدەی رابووردوودا نوێنەرانێکی وەك "شیللی"[3]، "بایرون"[4] و "کیتز"[5]ی بە جیهان پێشکەش کردووە، لای

---

(1) Tintern
(2) Words wort
(3) Shelly
(4) Byron
(5) Keats

من لە دەورانی "کلاسیك" زیاتر جێگای سەرنجە.

باس لەبارەی هۆنراوەوە هاتە پێش، نازانم جامە بچووکەکەی "لاکسلی" نووسراوەی "تنیسۆن"[1]ت خوێندۆتەوە؟

بەهەرحاڵ من هەموو رۆژێك دەچم بۆ ژیمناستیك. لەم دواییانەدا کارمەندێکیان لەوێ داناوە. هەر کەس تووشی هەڵەیەك ببێ، یان گوێ نەداتە رێوشوێنەکان تووشی کێشە دەبێ.

مەلەوانگەیەکی جوانیشیان لە سیمان و بەردی مەرمەڕ لێ ساز کردووە، کە دیاریی کەسێکە پێشتر خوێندکاری ئەم زانکۆیە بووە. "مەك براید"، ئەو کچەی لەگەڵ من هاوژوورە جلی مەلەکەی خۆی دامێ (چووبووە ئاو و بەبەری نەدەکرد).

بڕیارم داوە بەم زووانە مەلە فێر بم.

دێسێری دوێنێ شەوی ئێمە بەستەنییەکی رەنگ چێرەیی زۆر بەتام بوو. لێرە بۆ رەنگ کردنی خواردەمەنی لە رەنگی رووەکەکان کەڵك وەردەگرن. زانکۆ بەگشتی کەڵك وەرگرتن لە رەنگە جەوهەرییەکانی بۆ لەشساخی و جوانکاریی پێ باش نیە.

ماوەیەکە هەوا زۆر خۆشە. بەرۆژدا خۆرەتاوە و پەڵەی هەوری بچکۆلە لە ئاسمانی شین بوونەتە زیوەر. جارجاریش بەفر دەباری و من و هاورێکانم لە چوونە سەر کەلاسی دەرس و چوون بەملاو ئەولادا شاد و خۆشحاڵ دەبین.

بەرێز "ئیسمیت"! هیوادارم کاتێك ئەم نامەیەت پێدەگا لەوپەڕی خۆشی و لەشساخی بی.

لەگەڵ رێز و ئیحترام

---

[1] Tennyson

جودی

## ٢٤ی ئاپریل

## بابەی خۆشەویست

دیسان بەهار هاتەوە. بریا تۆش بتدیبا کە باخی زانکۆی ئێمە چەند جوان بووە. لانیکەم خۆت بە تەنیا وەرەوە بیبینە بێ ئەوە من پێت بزانم.

هەینی رابووردوو بەرێز "جروی" بۆ چەند خولەکێك هاتە ئێرە. بەڵام کاتەکەی باش نەبوو. راست لەو کاتەدا منو "جولیا"و "سالی" هەڵدەهاتین کە بە شەمەندەفەر بگەین. پێتوایە دەمانویست بۆ کوێ بچین؟ دەچووین بۆ "پرینستون" کە لە جێژنی "باڵ"ی ئەوێدا بەشداری بکەین.

ئیزنم لەتۆ نەگرت. چونکو دەمزانی سکرتێرەکەت لە وەڵامدا دەینووسی "نا"، بەڵام نیگەران مەبە ئیزنی فەرمیمان لە زانکۆ وەرگرتو خاتوو "مەك براید"یش وەك سەرپەرشت لەگەڵمان بوو. زۆرمان خۆش لێرابرد بەڵام ئێستا ناپرژێ بەوردی بۆت بنووسم.

ئەمڕۆ لەو کەسانە بووین کە زوو لە خەو هەڵدەستن. نیگابانی ئێشك گر خەبەری کردینەوە. ئێمە شەش کەس بووین. لەسەر ئاگر قاوەمان ساز کردو پاشان بە پێیان دوو میل بە رێگادا رۆیشتین تا گەیشتینە گردی "تاقەدار" بۆ ئەوە تماشای هەڵاتنی تاو بکەین. لە کۆتایی هەورازەکەدا ناچار بووین بە چنگەکوورێ سەربکەوین. هیچی وای نەمابوو کە هەتاو پێش ئێمە هەڵبێ! رەنگە وا بیر بکەیەوە کە لە گەڕانەوەماندا مەیلی هیچمان نەبووە! ئای بابەگیان! لەم لاپەڕەیەدا چەند نیشانەی سەرسووڕمانم داناوە!

دەمویست لەبارەی خونچەی دارەکان، رێگا نوێیەکەی گۆڕەپانی وەرزش،

وانەی بێتامی سبەینێ کە لە بواری "ژینناسی" (بیولوژی)ـەوە هەمانە، لۆتکەکانی سەر دەریاچە، "کاترین پرینتس"[1] کە تووشی سینەپاڵوو بووە، پشیلە توکنەکەی "پریکس"[2] کە لەماڵ دەرچووەو دوو حەوتوو لە عەمارەتی "فەرگۆسن"دا مابۆوە کە سەرنجام خزمەتکار پێی زانیو هەواڵەکەی راگەیاندو هەروەها ۳ دەست جلوبەرگی خۆمەوە (بە رەنگەکانی سپی، چێرەیی‌و ئاوی‌و کلاوێکی جوان) نامەت بۆ بنووسم، بەڵام زۆرم خەو دێ‌و ئەو کارەم پێناکرێ. هەموو کات بیانووی نوستن دێنمەوە، وانیە؟ ئەوەش بزانە زانکۆی کچان شوێنێکی پڕجۆش‌و خرۆشەو مرۆڤ تا ئێوارە بە تەواوی ماندوو دەبێ، بەتایبەت ئەگەر ئەم جۆش‌و هەرایە لە بەیانی زووەوە دەستی پێ بکرێ.

لەگەڵ رێزو خۆشەویستیم

"جودی"



وێنەی پشیلەکە

---

[1] Catherin Printss
[2] Preks

بەم وێنە بۆت دەر دەکەوێ "پریکس" چەندە تووکنە

## ١٥ی مەی

## بابە لاق درێژی ئازیز

ئایا ئەوە بەشێکە لە ئەدەب‌و زانایی کە مرۆڤ لەنێو ماشیندا دابنیشێ‌و لە رووبەڕووی خۆی مات بمێنێ‌و تماشای کەس نەکا؟

ئەمڕۆ خاتوونێکی زۆر تەرپۆش (جلوبەرگەکەی لە مەخمەر بوو) چووە نێو ماشین‌و ماوەی ١٥ خولەك ماق‌و بێحاڵەت لە رێکلامێك ورد دەبۆوە کە لەبارەی قەیتانی گۆرەوییەوە بوو.

من پێم وایە ئەوە کارێکی زۆر دوور لە ئەدەبە کە خەڵك بە هیچ بزانێ‌و وا بنوێنێ کە کەسێکی زۆر گەورەو گرانە.

لەو کاتەدا کە ئەو لە رێکلامی قەیتانی گۆرەوی ورد دەبۆوە، من تماشای ماشینێکم دەکرد پڕ بوو لە کەسانێکی جێێ سەرنج.

ئەو وێنەیە کە بۆت دەنێرم بۆ یەکەمجارە چاپ دەکرێ. وا دەردەکەوێ کاکڵە مێشانێکە کە بە بەنێکەوە شۆڕ بۆتەوە. بەڵام وا نیە. ئەوە وێنەی منە کە لە مەلەوانگەی وەرزشگە دەمویست مەلە فێر بەم.



راهێنەری مەلەوانگە تەنافێکی بە ئاڵقەیەك بە پشتی منەوە قایم دەکرد، سەرێکی تەنافەکەی بە غەرغەرەیەك کە بە میچەکەوەیە بوو ڕەت دەکردو بەدەستییەوە دەگرت. ئەگەر مرۆڤ بە لێزانیی راهێنەرەکەی بڕوای هەبێ زۆر باشە. بەڵام من زۆر نیگەران بووم کە نەکا تەنافەکە بپسێ. بۆیە بەدایم بە دڵەڕاوکێوە ئاگام لە راهێنەر بوو. لە راستیدا لە یەك کاتدا نیگەرانی دوو شت بووم. لە لایەك نیگەرارنی ئەوە بووم کە تەنافەکە بپسێو لە لایەك نیگەرانی فێربوونی مەلە. هەر بۆیە بە باشی فێری مەلە نەبووم.

هەواکەی گۆڕا. کاتێك دەستم بە نووسین کرد باران بە خوڕم دەباری. کەچی ئێستا هەتاوەو منو "سالی" دەمانەوێ یاریی "تێنیس" بکەین کە لە ژیمناستیکمان پێ نەکەن.

پاش یەك حەوتوو

دەبیا زۆر پێش ئێستا کۆتاییم بەم نامەیە بهێنایە، بەڵام نەکرا. بابە گیان! ئەگەر دەستوخەتەکەم زۆر ڕێك و پێك نییە، لێم قەڵس نابی؟ زۆرم پێخۆشە نامەت بۆ دەنووسم. چونکە وا هەست دەکەم نامە بۆ بنەماڵەی خۆم دەنووسمو ئەو هەستە زۆر خۆشحاڵم دەکاو بۆم دەبێتە هۆی بڕوا بەخۆبوون.

دەتەوێ شتێکت پێ بڵێم؟ تۆ تەنیا پیاوێك نیی کە نامەت بۆ دەنووسم، بێجگە لە تۆ دوو کەسی دیکە هەن کە نامەیان بۆ دەنووسم. ئەمساڵ لە بەڕێز "جروی"بەوە چەند نامەی دوورو درێژم بۆ هاتووە (سەری پاکەتەکان بە ماشینی چاپ دەنووسێ کە "جولیا" نەزانێ نامەکە لە لایەن کێوەیە). تۆ بڕوات بە شتی وا دەکرد؟ جاروبارێش نامەیەکم بە دەستوخەتێکی ناخۆش وەك ئەوە قرژاڵ

بەسەر کاغەزدا رۆیشتبێ لە "پرینستون"ـەوە بەدەستم دەگا. مـن زۆر رەسمـی وەڵامی ئەو نامانـە دەدەمـەوە. دەبینـی کـە لـە نێـوان مـن و کچـەکانی دیکـەدا جیاووازییەك نیە. منیش وەك ئەوان لەگەڵ پیاوان نامە بۆ یەکتر دەنێرین.

نازانم بۆم نووسیوی یان نا کە بە ئەنـدامی ئەنجومـەنی "دراماتیـك"ی سـاڵە ئاخرەکـان هەڵبـژێردراوم؟ رێکخراوێکـی زۆر رێـك و پێکـە. لـە نێـوان هـەزار خوێندکاردا تەنیا حەفتاو پێـنج کەسیان بـە ئەنـدام قبـووڵ کـردووە. پێتوانیـە چـونکە مـن سوسیالیسـتێکی راسـت و درووسـتم دەبـێ بـبم بـە ئەنـدامی ئـەو ئەنجومەنە؟

ئایا دەتوانی بیری لێ بکەیەوە کامە باسی کۆمەڵناسی فکری منی بەخۆیەوە خەریك کردووە. بەڵێ. من دەمەوێ لەبارەی سەرنجدان بە ژیانی ئەو منداڵانەی کە لەژێر سەرپەرشتی کەسانی دیکەدان مەقالەیەك بنووسم.

مامۆستای کۆمەڵناسیی زانکۆ لەبارەی هەموو خوێندکارانەوە لێکۆڵینەوەی کرد. لەنێو هەمواندا منی پەسند کرد (پێت سەیر نیە)؟

زەنگی ژەمی شێو لێدرا کە دەچم بۆ ساڵۆنی نـان خـواردن لەسـەر رێگامـدا نامەکە پۆست دەکەم.

لەگەڵ پێشکەشکردنی رێزم

- ج -

**٤ی ژووئیه**

**بابەی خۆشەویست**

سەری هیچم ناپەرژێ. تەنیا دە ڕۆژمان بۆ کۆتایی دەرس خوێندن (فارغ التحصیل) ماوەو تاقیکردنەوەکان لە سبەینێوە دەست پێ دەکا. حەشیایەك چەمەدانو شتومەکم هەیە کە دەبێ بیانپێچمەوە. لە لایەکی دی، دنیای دەرەوەی ژوورەکە بە ڕادەیەك جوانو خۆشە کە مرۆڤ دڵی نایە لە ژوورەکەیدا دابنیشێ.

بەڵام قەیدی نیە. بە زوویی پشوو دەست پێ دەکا. "جولیا" بۆ پشووی ئەمساڵ" دەچێ بۆ ئورووپا. ئەمە چوارەمین جاریەتی کە دەچێ بۆ ئەوێ.

بێگومان خۆشیەکان دادوەرانە بەش نەکراون. بابە گیان! "سالی"یش وەکوو جاران دەچێ بۆ "ئادیرداگز". پێت وایە من بۆ کوێ دەچم؟ دەتوانی بە سێ جۆر بیری لێ بکەیتەوە. "لاك ویلو"؟ نەخێر. لەگەڵ "سالی" بۆ "ئادیرداگز"؟ نەخێر (ساڵی پار خەجاڵەت بوومەوەو ئیدی لە چوون بۆ ئەوێ بیر ناکەمەوە). بابە گیان! وا دیارە هێزی بیرکردنەوەت لاوازە. با خۆم پێت بڵێم. بەو مەرجەی بەڵێنی بدەی ڕێگام لێ نەگریو هەراو هەنگامە وەڕێ نەخەی. لە ئێستاوە بە سکرتێرەکەت ڕادەگەیەنم کە لە بڕیاری خۆم پاشگەز نابمەوە.

هاوینی ئەمساڵ دەمەوێ بچم بۆ کەناری دەریاو هەموو هاوین لەگەڵ خاتوونێکدا بم بەناوی "چارلز پاترسون"[1] و دەرس بە کچەکەی بڵێم کە ئەمساڵ

---

[1] Charles Paterson

دەچێتە زانکۆ. من بەهۆی خاتوو "مەك براید"ەوە لەگەڵ ئەو خانمە ئاشنا بووم. خانمێکی زۆر باشە. قەول وایە بە کچە بچووکەکەشی دەرسی ئینگلیسیو لاتین بڵێم. لە ڕۆژدا چەند کاتژمێریش وەختی ئازادم هەیە کە کار بۆ خۆم بکەم. بابەتی وانە گوتنەوە مانگانە ٥٠ دۆلارم دەدەنێ! پێت وانیە ٥٠ دۆلار پارەیەکی زۆرە؟ خاتوو "پاترسون" خۆی ئەو مەبلەغەی پێشنیار کرد، ئەگینا من پێم عەیب بوو زیاتر لە ٢٥ دۆلار وەرگرم. کاری من لە "مانگولیا"[2] (ماڵی خاتوو پاترسون لە مانگولیایە) سەرەتای سێپتامبر تەواو دەبێ. لەوانەیە سێ حەوتووی ئاخری پشوودانم بچم بۆ "لاك ویلو". بیری خاتوو "سمپل"و دۆستانی دیکەی وەك ئاژەڵو مرۆڤەکانی ئەوێ دەکەم. بەرنامەکەت پێ چۆنە؟ دەبینی وەردە وردە بەرەو سەربەخۆیی دەچم. دیارە تۆی کە منت لەسەر پێ ڕاگرتو پێموایە ئێستا دەتوانم بە تەنیا خۆم بە ڕێگادا بڕۆم.

جێژنی کۆتایی ساڵی دەرسخوێندنی "پرینستن"و تاقیکردنەوەکانی ئێمە کەوتوونەتە یەك. زەربەیەکە کە تەحەمول ناکرێ. منو "ساڵی" دەمانویست بچین بۆ جێژنی کۆتایی ساڵی دەرس خوێندنی پرینستن. بەڵام ئێستا ئیمکانی نابێ.

بەدوعا بابە! هیوادارم ئەم هاوینەت خۆش لێڕابووریو لە هەر جێگایەك هەی باش بحەسێیەوەو بەهێزێکی تازەوە دەست بە کارەکانت بکەیەوە (ئەم ڕستەیە کە دەبیا تۆ بۆ منت نووسیبا) چونکە من بە هیچ شێوەیەك نازانم تۆ لە هاویندا چی دەکەیو کاتەکانت چۆن لێڕادەبووری. من ناتوانم چۆنیەتیی ژیانی تۆ بهێنمە بەرچاوی خۆم. تۆ یاریی گوڵف دەکەی؟ دەچیتە ڕاو؟ ئەسپ سواری دەکەی؟ یان لەبەر هەتاو دادەنیشیو وەنەوز دەدەی؟ لە هەرحاڵدا هەرچی

---

[2] Mangolia

دەکەی‌و لە هەرکوێ هەی خۆش‌و شاد بەو "جودی" لەبیر نەکەی.

**١٠ی ژوئیە**

**بابەی خۆشەویست**

ئەمە دژوارترین نامەیە کە تا ئێستا نووسیومە. بەڵام هەرچۆنێك بێ بڕیاری خۆم داوەوو گۆڕانیشی بەسەردا نایە.

ئەمە ئەوپەڕی لوتفی تۆیە کە دەتەوێ ئەم هاوینە بمنێری بۆ ئوورووپا. کاتێك ئەو نامەیەم خوێندەوە، لە پێشدا زۆرم پێ خۆش بوو. بەڵام لەحزەیەك دواتر بەخۆدا هاتمەوەو گوتم "نا"! ئەوە درووستە پارەی خەرجیی زانکۆت لێ قبووڵ نەکەم، بەڵام بۆ گەڕان‌و خۆشڕابواردن پارەت لێ وەرگرم؟ نابێ تۆ بەو شێوە ژیانە عادەتم بدەی. ئینسان هەوەسی ئەو شتانە ناکا کە هەرگیز نەیچێشتبێ. بەڵام ئەگەر بۆ یەك جار چێژی لە شتێك وەرگرت‌و دواتر بۆی نەلوا، زۆری بەلاوە زەحمەت دەبێ. چونکە ئیدی خۆی بە شیاوی ئەوە دەزانێ کە ئەو شتەی لە بەردەست دا بێ.

ژیان لەگەڵ "جولی"و "سالی" زیانی بۆ بیروبڕوای ئینسانیی من هەیە. ئەوان لە منداڵیەوە ئەوەی ڕیستوویانە لەبەردەستیاندا بووە. ئەوان بەختەوەری بە مافی خۆیان دەزانن. پێیان وایە ئەوەی کە دەیانەوێ، جیهان قەرزداریانەو دەبێ پێیانی بدا. ڕەنگە واش بێ. چونکە جیهان ئەو قەرزدارییەی قبووڵ کردووە. بەڵام ئەم جیهانە هەر لە یەکەم ڕۆژەکانەوە بە منی ڕاگەیاندووە کە قەرزدارم نیەو من مافی ئەوەم نیە بێ ئەوە دەستەبەرێکم هەبێ، شتێك قەرز بکەم. چونکە جیهان بە مافی من نامۆیەو ڕەتی دەکاتەوە.

بە گوتنی ئەو ڕستەیە وەك ئەوەیە خۆم لە گێژاوێك هاوێشتووەوو پەلەقاژێمە. هیوادارم لە مەبستەکەم تێبگەی. هەرچۆنێك بێ زۆر بە جیددی پێموایە کە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە ئەم هاوینە دەرس بڵێمەوەو بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی خۆم هەنگاو

هەلگرم.

## "مەنگۆلیا"

## چوار رۆژ دواتر

بەشی سەرەوەی ئەم نامەیەم دەنووسی کە ... دەزانی چی رووی دا؟ خزمەتکار کارتی بەرێز "جروی" بۆ هێنام. بەرێز "جروی"ش ئەم هاوینە دەچێ بۆ ئورووپا. دیارە نەك لەگەڵ "جولیا"و بنەماڵەکەی بەڵکوو بەتەنیا.

من بۆم باس کرد کە تۆ پێشنیارت پێ کردووم کە لەگەڵ دەستەیەك کیژ لەژێر چاودێریی خاتوونێك بڕۆم بۆ ئورووپا.

بەرێز "جروی" لە وەزعی تۆ ئاگادارەو هەروەها دەزانێ کە بابو دایکی من مردوونو کەسێکی دلۆڤان منی ناردۆتە زانستگە. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە من ئەو ئازایەتیەم لە خۆمدا نەدەدی کە لەبارەی هەتیوخانەی "جان گریر" شتێکی پێ بڵێم. ئەو وا دەزانێ تۆ کە دۆستێکی لەمێژینەو جێگای متمانەی بنەماڵەی، سەرپەرشتی من دەکەی. هەرگیز پێم نەگوتووە کە تەنانەت تۆم نەدیوەو ناتناسم. چونکە زۆر زۆر جێگای پێکەنینە.

هەرچۆنێك بێ بەرێز "جروی" پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە بانگهێشتنەکەی تۆ قبووڵ بکەمو بچم بۆ ئورووپا. ئەو پێی وایە کە سەفەرو گەڕان جۆرێك لە پەروەردو فێربوونەو من نابێ ئەو دەعوەتە رەت بکەمەوە. بەرێز "جروی" دەچێ بۆ پاریس. دەیگوت ئەگەر منیش بچم بۆ پاریس، دەتوانین لە پەناوە بچینە رێستورانە قەدیمییەکانو پێکەوە نانی شێو بخۆین، ئەو جێگایە زۆر جار بیانیەکانی دەچنێ.

راستیەکەت دەوێ بابە! ئەم قسانەم زۆر بەدڵ بوو. لەو بڕیارە کە دابووم، هەندێك خاوی کردمەوە. لەوانەیە ئەگەر ئەوەندە وەك ئەمڕ پێکردن نەبایە، بە تەواوی تەسلیم دەبووم. کەسێك دەتوانێ هێدی هێدی ڕێگام پێ بگۆڕێ، بەڵام هەرگیز سەر بۆ کاری زۆرەملێ دانانەوێنم.

لە هەرحاڵدا بەڕێز "جروی" دەیگوت کە من کچێکی لاسار، گوێڕانەگر، کەللەڕەق و بێئاوەزم (ئەمانە تەنیا چەند سیفەتێکن کە بۆ نووسین دەبێ ئەوانی دیکەم لەبیر نەماوە). دەیگوت من هێزی لێکدانەوەم لاوازە، چاکەو خراپەی خۆم بۆ لێك جیا ناکرێتەوەو دەبێ بێڵم گەورەکان لەبارەی منەوە بڕیار بدەن. بەکورتی کارمان گەیشتە ناخۆشی.

لەکورتی بیبڕمەوە، بە پەلە کەلوپەلەکانم پێچاوەو وەڕێکەوتم. وام بە باش زانی کاتێك کۆتایی بەم نامەیە بێنم کە هاتبێتمە ئێرەو کار لە کار ترازابێ و شوێنێك بۆ گۆڕینی بڕیارەکەم نەمابێتەوە.

ئێستا من لە "گلیف تاپ"[1]م (ئەمە ناوی ویلای خاتوو "پاترسون"ـە). چەمەدانەکانم کردۆتەوەو "فلۆرانس"[2] (کیژە بچکۆلە) لەگەڵ جێناوەکان (چمیرەکان) لە ململانێدایە. ئەو منداڵێکی زۆر نووزن و ناز نازییە. لەپێشدا دەبێ شێوەی دەرس خوێندنی فێر کەم. پێموایە بە درێژی تەمەنی بێجگە لە بەستەنی و سۆدە بیری لە شتێکی دیکە نەکردبێتەوە.

ئێمە لەسەر تەپۆلکەکە سووچێکی ئارامان بۆ دەرسخوێندن دیاری کردووە. خاتوو "پاترسون" پێی خۆشە منداڵەکان لە هەوای ئازاددا دەرس بخوێنن. ئەگەر ڕاستت دەوێ بەم ئاوو هەوایە کە پیار سەخۆش دەکاو ئەو دەریا شینە کە

---

[1] Glifftap
[2] Florence

بەلەمەکان تێیدا لە هاتووچۆدان، دژوارە کە بتوانم بیرو حەواسم لەجێی خۆیدا بێ. بیر دەکەمەوە ئەگەر لەسەر یەکێك لەم گەمییانەدا دەبووم‌و بۆ سەر زەوییە دوورەدەستەکان دەچووم ... بەڵام نابێ ئەم جۆرە فکرانە لەسەرم بدا، دەبێ هۆشم بەلای دەستووری زمانی لاتینەوە بێ.

بابەگیان! دەزانی چۆن بە جیددی دەستم بەکار کردووەو خۆم لە بیرو بۆچوونی خراپ دەپارێزم. تکات لێدەکەم لێم قەڵس مەبەو وا مەزانە خۆشەویستییەکانی تۆم لەبیر کردبێ. من هەمیشە میهرەبانییەکانی تۆم لەبەرچاوەو تەنیا رێگا بۆ وەڵام دانەوە بەو هەموو خۆشەویستییەی تۆ ئەوەیە کە بۆ کۆمەڵگام کەسێکی بەکارهاتوو بم (نازانم ژنانیش دەتوانن بۆ کۆمەڵگای خۆیان بەکارهاتوو بن یان نا؟ پێم وا نیە).

لە هەرحاڵدا ئەوکاتەی کە بووم بە کەسێکی بەکەڵك، دەتوانی ببینی‌و بڵێی "ئەمە ئەو کەسەیە کە من پێشکەش بە کۆمەڵگام کردووە". رستەیەکی زۆر جوانە بابە! وانیە؟ بەڵام نامەوێ راستیەکانت لێ بشارمەوەو بە هەڵە لێم حاڵی بی. ئەویش ئەوەیە کە جاروبار وا نازانم کەسێکی تایبەت بم. دیارە زۆر باشە مرۆڤ بۆ ژیانی خۆی رێوشوێنی دروست بدۆزێتەوە، بەڵام لە هەرحاڵدا من هیچ جیاوازییەکم لەگەڵ کەسێکی ئاساییدا نیە. لەوانەیە ئاخریەکەی لەگەڵ "بەڵێندەر"[3]ێك پەیمانی هاوسەری ببەستم‌و لە کارەکانیدا بۆچوونی خۆمی پێ بڵێم‌و یارمەتیی بدەم.

بچووکی هەتا هەتایی تۆ

جودی

---

[3] بەڵێندەر: پەیمانکار

**١٩ی ئووت**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

لە پەنجەرەی ژوورەکەی منەوە دیمەنی زەوی، لە راستیدا دیمەنی دەریایەکی زۆر جوان دەبینرێ. تا چاو هەتەر دەکا ئاوەو گاشە بەرد. هاوین کەم کەم بە پێدەزکێ دایە. کاتێ من بەیانیان بە فێرکردنی ئینگلیسی، لاتین و جەبر بە دوو قوتابیی تەمەڵ رادەبرێ. نازانم "ماریون" چۆن دەتوانێ بچێتە زانکۆ، یان ئەگەر توانی چۆن دەتوانێ لە زانکۆ بمێنێتەوە. لە "فلورانس"یش بەتەواوی هیوابڕاو بووم، بەڵام زۆر جوان و لەبەر دڵانە.

ئەوانەی کە تا ئەو رادەیە جوانن من پێم وایە زیرەك بن یان تەمەڵ جیاوازیەکی نەبێ بۆیان. بەڵام جاروبار وا بیر دەکەمەوە کە وتووێژ لەگەڵ ئەم جۆرە جوان و شەنگانە چەندە مێردەکانیان ماندوو دەکا. مەگەر ئەوە کە بەخت یار بێ و مێردێك ببێ بە تووشیانەوە وەك خۆیان گێل و تەمەڵ بێ. کێشە نیە. چونکە جیهان پڕە لە گێل و تەمەڵ. من لەم هاوینەدا برێکی زۆر پیاوی گێلم دیتووە.

پاشنیوەڕۆیان لەسەر بەردەکانی کەنار دەریا پیاسە دەکەم. یان ئەگەر دەریا ئارام بێ مەلە دەکەم. من لە ئاوی سوێردا مەلەکردنم بۆ ئاسانترە. دەبینی ئەوەی کە فێری بووم کەلکیان لێ وەردەگرم.

نامەی بەڕێز "جروی پندلتون"م لە پاریسەوە پێگەیشت. نامەکە زۆر کورت بوو لەوەی کە بە گوێم نەکردووە یەشتا نەیبەخشیوم. لە هەرحاڵدا نووسیویە ئەگەر لەکاتی خۆیدا بگەڕێتەوە، پێش کرانەوەی زانستگە چەند رۆژێك دێتە

دیتنم بۆ "لاك ویلو"و ئەگەر میهرەبان، گوێڕاگرو ئاقڵ بم لەوانەیە لەگەڵم ئاشت بێتەوە. نامەیەکیشم لە "سالی"یەوە پێگەیشتووە، بانگهێشتی کردووم کە لە مانگی سێپتامبردا بۆ ماوەی دوو حەوتوو بچم بۆ ئۆردووگاکەی ئەوان. بلێی بۆ چوون بۆ لای "سالی" پێویست بێ لە تۆ ئیزن وەرگرم؟ یان ئەوەندە گەورە بووم کە خۆم بتوانم بڕیار بدەم؟ پێموایە ئیدی گەورە بووم‌و منداڵ نیم. من لە دوایەمین ساڵی زانکۆدام. مەگەر وا نیە؟

لەبەر ئەوەی هەموو هاوین کارم کردووە، پێموایە پێویستم بە هەندێك حەسانەوە هەیە. پێمخۆشە "ئادیران داگز" ببینم. پێم خۆشە براکەی "سالی" ببینم. بڕیارە "جیمی" لێخوڕینی بەلەمم فێر بکا بەڵام (ئێستا گەیشتینە سەر ئەسڵی مەتڵەب. واتە نەچوون. شتەکە زۆر گەوجانە دێتە بەرچاو) بەڵێ. دەمەوێ بەڕێز "جروی" لە ئوورووپا بگەڕێتەوە، بچێتە "لاك ویلو"و من لەوێ نەبم. دەمەوێ تێبیگەیەنم کە مافی ئەوەی نیە فەرمانم بەسەر دابسەپێنێ.

بابەگیان! هیچکەس بێجگە لە تۆ کە مافی خۆتە ـ مافی ئەوەی نیە ڕێو شوێنم بۆ دیاری بکا ـ هەرچەند جاروبار تۆش ئەو مافەت نیە. دەمەوێ بۆ گەڕان بچم بۆ ئێلاخ.

جودی

خێوەتگەی مەك براید

٦ی سێپتامبر

بابەگیان! نامەکەی تۆ لە کاتی خۆیدا نەگەیشت. ئەگەر دەتەوێ فەرمانەکانت جێبەجێ بکرێ، بە سکرتێرەکەت بفەرموو دوو حەوتوو زووتر فەرمانەکانت بە من رابگەیەنێ. هەر وەك دەبینی من پێنج رۆژە لێرەمو ئێستا نامەی تۆم پێدەگا.

لێرەوار جوان، هەوا نیشەبەخش، خێوەتگە زۆر لەبەر دڵان، بنەماڵەی "مەك براید" لێوانلێو لە دڵۆڤانیو خۆشەویستیو جیهان پڕە لە خۆشیو منیش زۆر شادو بەختەوەرم ...

"جیمی" بانگ دەکا بچین بۆ سواریی بەلەم ... خوات لەگەڵ. لەوەی کە فەرمانی تۆم بەڕێوە نەبرد داوای لێبوردن دەکەم. بەڵام بۆچی ئەوەندە دژی ئەوەی کە من کەمێك بەخۆشی رابوێرمو بەکەیف بم؟ من کە هەموو ئەم هاوینە کارم کردووە، مافی ئەوەم هەیە کە دوو حەوتوو لە حەسانەوەدا بم. تۆ زۆر لەگەڵم دڵڕەقی. لە هەرحاڵدا بابە گیان لەگەڵ ئەو هەموو هەڵانەت هەر خۆشم دەوێی.

جودی

## ١٣ى ئۆكتۆبر

## بابه لاق درێژى خۆشەويست

له دوايەمين سالّى خوێندنم له زانكۆدامو بۆ جارێكى دى موديرى گۆڤارى مانگانەى زانكۆم. جێگاى بڕوا نيه كه ئەم كچه بەلاّيه چوار سالّ لەمەوپێش له هەتيوخانەى "جان گرير"دا بووبێ. ئێمه له ئامريكا زۆر زوو سەردەكەوين‌و هەلّدەدەين.

تۆ پێت چۆنه؟ بەڕێز "جروى" له ياداشتێك دا كه بۆ "لاك ويلو"ى ناردووەو لەوێوه بۆ منيان رەوانه كردووه، دەنووسێ، لەبەر ئەوەى چەند كەس له هاوڕێيانى بۆ گەڕانى لەنێو دەريادا بانگهێشتنيان كردووه، به داخەوه ناتوانێ بێت بۆ "لاك ويلو"و هيواداره لەم هاوينەدا له ئيلاخ خۆشم رابواردبێ. ئەمه له حالێكدايه كه بەڕێز "جروى" دەزانێ من له "لاك ويلو" نيم‌و لەگەلّ بنەمالّەى "مەك برايد" دام (جوليا ئەو شتەى پێ گوتبوو). باشتر ئەوەيه پياوەكان فێلّ‌و كەلّەك بخەنه عۆدەى ژنان، چونكو ئێوه لەو كارەدا وەك ژنان پسپۆڕ نين.

"جوليا" يەك چەمەدانى پڕ له جلوبەرگى نوێى لەگەلّ خۆى هێناوه. يەكێك لەوانه جلى شەوه له قوماشى "كريپ"، نەخشى كۆلّكه زێڕينەى پێوەيەو تايبەتى يەرييەكانى بەهەشتە. پێموايه جلەكانى منيش جوانن. من لەڕووى جلەكانى خاتوو "پاترسون"و به هاوكاريى بەرگدرووێكى هەرزان چەند دەست جلوبەرگم دوورييەوه. ئەگەرچى دەقاودەقى ئەسلّەكه نەهاتۆتەوه، لەگەلّ ئەوەش من به جلەكانم زۆر دەنازم.

بەڵام ئێستا بۆ ئەوە دەژیم ڕۆژێك پاریس ببینم.

بابەگیان ڕەنگە لەوە کە کچ نی زۆر خۆشحاڵ بی پێت وابێ وەڕێخستنی ئەو هەرایە بۆ جلوبەرگ، کارێکی گەوجانە بێ. وانیە؟ بێگومان وا بیر دەکەیەوە. بەڵام خەتا لە خۆتەوەیە.

داخوا چیرۆکی ئەو وەستای ئەڵماسەت بیستووە کە دژی خشڵو خۆڕازاندنەوە بوو ئەوانەی بە شتێکی زیادی دەزانی؟ ئەو پێی وابوو کە جل بۆ داپۆشینی لەش لەبەر دەکرێو پێویست بە جوانی ناکا. ژنی وەستا کە مرۆڤێکی میهرەبانو گوێڕاگر بوو، شێوەی چاکسازیی لە جلوبەرگدا قبووڵ کردو جلی هێلو هەراوی دەدروو لەبەری دەکرد. پێت وایە وەستای ئەڵماس کە خێزانی بەو جلە ناحەزانەوە بینی، چی کرد؟ لەگەڵ کچێکی گۆرانیبێژ کە بە تەواوی لایەنگری خۆڕازاندنەوەو جلی دابی ڕۆژو خشڵو خاو بوو، ماڵی بەجێ هێشتو هەڵات.

لایەنگری هەتا هەتاییت

جودی،

پەراوێزی نامە:

خزمەتکاری ئەو بەشەی ئێمە سەربەرگی بە ڕەنگی شین لەبەر دەکا. دەمەوێ سەربەرگێکی قاوەیی بۆ بکڕمو ڕووپۆشەکەی ئێستای لەبەردیکەوە تێکەوە پێچمو فڕێی بدەمە نێو دەریا. هەرکاتێك لەو جلە شینانەدا دەیبینم گیانم دەلەرزێ. چونکە هەتیوخانەی "جان گریر"م وەبیر دێنێتەوە.

## ١٧ی نوامبر

## بابی لاق درێژی ئازیز

پێشکەوتنی من لە بواری ئەدەبیات دا تووشی بەرهەڵستێکی گەورە بووە! نازانم پێت بڵێم یان نا؟ پێویستیی زۆرم بە دڵدانەوەیە. تەنیا دڵدانەوەو بەس. تکات لێ دەکەم لە نامەی داهاتوودا لەوسۆرخەوە شتێکم بۆ نەنووسی کە برینەکەمی پێ بکولێتەوە.

هەموو شەوانی زستانی رابووردووو هەموو هاوین، ئەو کاتانەی کە دەرسم بە قوتابییە تەمەڵەکانم دەگوتەوە، کتێبێکم نووسی‌و پێش کرانەوەی زانکۆ تەواوەم کردو بۆ چاپ ناردم بۆ یەکێك لە چاپخانەکان. لەوێ دوو مانگ رایان گرت. دڵنیا بووم کە قبووڵیان کردووە. بەڵام دوێنێ بەیانی بەستەیەکم لە پۆستخانەوە پێگەیشت (پانزدە سێنت کەمایەسیی پووڵیشی هەبوو). جەنابی بەرپرسی چاپخانە کتێبەکەی لەگەڵ نامەیەکی "باوکانە" بۆ ناردبووەمەوەو زۆر راشکاوانە بۆی نووسیبووم کە: بەپێی ئادرێسەکەم وا دەر دەکەوێ کە من هێشتا خوێندکاری زانکۆم‌و ئەگەر گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی ئەوبم، پێشنیارم پێ دەکا کە کات‌و هێزی خۆم لە فێربوونی وانەکانمدا بەکار بێنم. تا رۆژێك دەرسی زانکۆم کۆتایی پێ دێ، ئەو کات دەست بە نووسینی کتێب بکەم.

ئەو بۆچوونانەی خۆی کە لەبارەی کتێبێکەوە نووسیبووی ئەمانەن:

گەلاڵەی چیرۆك دوورە لە راستی، تایبەتمەندیی دەروونی کەسانی نێو چیرۆك زیادەڕۆیی تێدا کراوەو وتەکان هەموو ناسروشتین. هەندێك وتەی جوانی تێدایە،

بەڵام سەلیقەی پێویستیان تێدا بەکار نەبراوە. پێشنیاری کردووە نائومێد نەبم‌و بە تێکۆشانی خۆم درێژە بدەم. لەوانەیە لە داهاتوودا نووسەرێکی باش بم ... ئەمە بۆچوونێکی هاندەر نیە.

بابەگیان! وا نیە؟ بڕوام پێ بکە وام دەزانی شوێنەوارێك لەسەر ئەدەبیاتی ئامریکا دادەنێم. دەمویست پێش تەواوبوونی دەرسەکانم لە زانکۆ، کتێبێکی باش بنووسم‌و ببم بەهۆی سەرسووڕمانی تۆ. باس‌و مەتەڵەبەکانی چیرۆکەکەم ساڵی پێش ـ جێژنی کریسمەس ـ کە لە ماڵی "جولیا" بووم کۆ کردەوە. بەڵام چاپخانەکە حەقیەتی. بەڵێ. دوو حەوتوو بەس نیە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ڕێوڕەسمی شارێکی گەورە ئاشنا بێ.

دوێنێ کە بۆ پیاسە دەچووم کتێبەکەم لەگەڵ خۆم برد، کاتێك گەیشتمە ژووری مۆتۆرخانەی گەرمای ناوەندی، چوومە ژوورەوەو بە بەرێوەبەرم گوت بۆم هەیە چەند ساتێك لە کوورەی ئاگرەکە کەڵك وەرگرم؟ ئەو زۆر بەڕێزەوە دەرکی کوورەکەی کردەوەو من بە دەستی خۆم کتێبەکەم هاوێشتە نێو ئاگرەکەوە. ڕاست وێدەچوو بە دەستی خۆم منداڵەکەم سووتاندبێ.

دوێنێ شەو بە دڵێکی شکاوو نائومێدەوە لەسەر نوێنەکەم ڕاکشام. وام بیر دەکردەوەوە کە ئاخریەکەی بە هیچ نابم‌و ئەو پارەی لە مندا سەرفت کردووە بەزایە چووە. بەڵام بڕوا بکە بەیانیەکەی بە پلانێکی نوێوە لەخەو هەستام‌و ئەمڕۆ بۆ هەر شوێنێك دەچووم‌و هەر کارێکم دەکرد، لە بیرکردنەوەدا بووم‌و کەسایەتییەکانی چیرۆکم دەخولقاندو شادو خۆشحاڵ بووم. هیچکەس ناتوانێ تۆمەتی ڕەشبینیم لێ بدا. ئەگەر مێردەکەم‌و دوازدە منداڵم بەهۆی بوومە لەرزەیەکەوە بچنە ژێر خاك، ڕۆژی دوایی بە سیمایەکی شادو زەردەخەنەوە بەشوێن مێردێکی دیکەدا دەگەڕێم.

## ١٤ی دیسامبر

## بابه لاق درێژی خۆشەویست

دوێنێ شەو خەونێکی زۆر سەیرو سەمەرەم بینی. لە خەونەدا چوومەتە کتێبخانەیەك. بەڕێوەبەر کتێبێکی بۆ هێنام بەناوی "بەسەرهات‌و نامەکانی جودی ئابووت"، رووبەرگی کتێبەکە قوماشێك بوو بە رەنگی سوورو وێنەی هەتیوخانەی "جان گریر" بەسەر رووبەرگەکەوە بوو. لە لاپەڕەی یەکەمدا وێنەی منیان چاپ کردبوو لەژێر وێنەکەدا نووسیبوویان: ئیرادەتمەندی راستەقینە "جیرۆشا ئابۆت".

دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە. خوێندمەوەو خوێندمەوە. کە ویستم دوایەمین لاپەڕە هەڵدەمەوەو بزانم لەسەر بەردی گۆڕەکەم چی نووسراوە، لەخەو راچەنیم. زۆرم پێ ناخۆش بوو، چونکە نەمزانی مێردم بە کێ کردووەو کەی دەمرم.

زۆر باشە سەربردەی مرۆڤ بەهۆی غەیبزانێکەوە بەڕاشکاوی بنووسرێتەوە! بەڵام بەو مەرجەی بهێڵن مرۆڤ بەسەرهاتی خۆی بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی قەت بیری نەچێتەوە. ئەوکات مرۆڤ ساتبەساتی ژیانی خۆی دەزانێ کە چی کردووە، چی دەکاو کەی دەمرێ.

پێتوایە چەند کەس پەیدا دەبن کە ئازایەتی ئەوەیان هەبێ پێشگۆیی ژیان خۆیان بخوێننەوە.

ژیان بەگشتی بێ‌ئەم پێشگۆییانە بێتامە. بەدایم دەبێ بخۆی‌و بنووی. هاوار

لەو رۆژە کە مرۆڤ هەموو شت بزانێ‌و هیچ رووداوێکی چاوەڕوان نەکراوی بۆ نەیەتە پێش. ئەی هاوار! کەسێك جەوهەر کەوتە سەر نامەکە. بەلام لاپەڕەی سێیەمەو ناکرێ لە ئەوەڵەوە نامەکە بنووسمەوە.

ئەمساڵیش دیسانەوە "ژیننناسی" دەخوێنین. دەرسێکی جێگای سەرنجە. دەرسی ئێستای ئێمە دەزگای هەزمی خواردەمەنییە. نازانی کاتێك ریخۆڵە چووکەی پشیلە بە شێوەی ئەستوونی ببڕن‌و بیخەنە ژێر "میکرۆسکۆپ" چەندە جوانە. فەلسەفەش دەخوێنین دەرسێکی سەرنجڕاکێشە. بەلام زوو لەبیر دەچێتەوە. ژیننناسیم پێ خۆشترە. باس لەبارەی فەلسەفەوە قەت تەواو نابێ ... ئەم پێنووسە! قوڕ بەسەرەم هەر دڵۆپە دەکاو فرمێسك دەڕێژێ لێم ببوورە.

بەڕاست بابە! تۆ بڕوات بە ئازادیی خواستۆ ئیرادە هەیە؟ من بێ‌ئەملاو ئەولا بڕوام پێی هەیە. من لەگەڵ ئەو فیلسووفانە نیم کە پێیان وایە هەر کارێك مرۆڤ ئەنجامی دەدا بە خواستی خۆی نیەو لە لایەن هێزێکی بالاوە پێی دەکرێ. من ئەو شێوە بیرکردنەوەم پێ بێکەلکە. کەوابێ هەر کەسێك هەر کارێك دەکا کردوویەو مافی سەرکۆنەکردنی نیە. ئەگەر کەسێك بڕوای بە قەدەرو چارەنووس هەبێ، دەست لەسەر دەستی دادەنێ‌و دەڵێ، هەرچی دەبێ با ببێ‌و پێی رازییە.

من بە تەواوی بە ئازادیی ئیرادەو هێزی خواستن بڕوام هەیەو پێم وایە مرۆڤ بەم بیرو بڕوایەوە دەتوانێ کێو لەبێخ بێنێ. سەبرت هەبێ. با ببم بە نووسەرێکی گەورە! ...

چوار فەسڵ لە کتێبە تازەکەم تەواو کردووەو گەلالەی پێنج فەسڵەکەی دیکەشم داناوە. بابا گیان! ئەم نامەیە زۆر تێکەڵ پێکەڵە هیوادارم سەرت نەهێنێتە ئێش. وا باشترە کۆتایی پێ بێنم‌و کەمێك شوکولات درووست بکەم. بەداخەوە ناتوانم لەو شوکولاتەت بۆ بنێرم بەتایبەت ئەمجارە بە تۆی شیرو

ڕۆنەکەرە سازی دەکەم.

پەراوێزی نامە:

کەلاسی "ژیمناستیک"م هەیە. سەمای مودێرن‌و فانتیزی فێر دەبم. سەیری ئەو وێنەیە بکە خۆم کێشاومەو بۆم ناردووی. ئێمە سەمای باڵەیەکی زۆر باش دەکەین، ڕاست وەك باڵەیەکی ڕاستەقینە. ئەوەی لە کەناری وێنەکەدایەو جووڵەکانی نەرم‌و زەریفن، خۆمم.



وێنەی سەماکە

**٢٦ی دیسامبر**

**بابەی زۆر، زۆر، زۆر ئازیزم**

ئەوە چیت کردووە؟ مەگەر نازانی بەجارێك حەڤدە جێژنانە بە کچێك نادرێ؟ لەبیرت بێ من سوسیالیستم. دەتەوێ بمکەی بە کەسێکی "پلوتوکرات"[1]. بیر بکەوە، ئەگەر بە رێکەوت ساردییەك کەوتە نێوانمان، منی چارەڕەش دەبێ کامیۆنێك بەکرێ بگرم تاکوو بتوانم جێژنانەکانی تۆ بنێرمەوە. ئەو ملپێچە کە بۆم ناردبووی شتێکی باش نەبوو. داوای لێبوردنت لێ دەکەم. بەدەستی خۆم چنیومە (بێگومان بە خراپییەکەی دا بۆت دەردەکەوێ کە دەستووکاری منە). لە رۆژە ساردەکاندا لە ملی بەستە، پاشان دوگمەی سەربەرگەکەت تا سەرەوە داخەو کراواتەکەشت لەژێریدا داپۆشە.

بابەگیان! زۆر زۆر سپاست دەکەم. تۆ باشترین بابەی ئەم دنیایەی‌و هەر لەو حاڵەدا باشترینیان.

چلێك شەوەری چوار گەڵای پێوەیەو لە ئیلاخی "مەك برایەد"وە لەگەڵ خۆم هێناومە، بۆت دەنێرم بەئومێدی بەختەوەریت لە ساڵی نوێدا.

"جودی"

---

[1] Plutocrat

## ٩ی ژانویە

بابەگیان دەتەوێ کارێك بکەی کە ببێتە هۆی رەستگاریی هەتا هەتاییت؟ بنەماڵەیەکی چارەڕەش دەناسم کە لە هەموو بارێکەوە گیرۆدەی هەژاریو بێدەرەتانین. ئەم بنەماڵەیە بریتین لە دایكو بابو چوار منداڵ. دوو لە کوڕەکان کە گەورەترن شوێنی کارو ژیانی خۆیان کەوتوونو نەگەڕاونەتەوە نێو بنەماڵە. بابی ئەم بنەماڵەیە لە کارگەیەکی شیشیەسازی کاری کردووەو تووشی نەخۆشی دەردەباریکە بووە. ئێستا لە نەخۆشخانەیو هەموو پاشەکەوتەکانیان لە رێگای بابی نەخۆشیاندا خەرج کراوە. ئێستا قورسایی ئەم بنەماڵەیە بەسەرشانی کچێکی گەورەترە کە ٢٤ ساڵی تەمەنە. ئەم کچە ئەگەر کاری دەست بکەوێ، رۆژی بە دۆلارو نیوێك کاری خەیاتی دەکا. شەوانیش کاری دروومانی گوڵ درووست کردن لەسەر قوماش دەکا. دایك لەکار کەوتووەو بێتوانایەو زۆریش ئیماندارە. بۆ چەند کاتژمێر دەست لەسەر دەستی دادەنێو دادەنیشێ، لە حاڵێکدا کچەکەی ئەو هەموو هەوڵە دەدا بۆ ئەوەی ژیانیان بەڕێوە بچێ. بەهۆی کارو زەحمەتەوە زۆر ماندووەو لەوانەیە بمرێ. هەموو کات لە دڵەڕاوکێ دایە کە زستانی داهاتوو چیان بەسەر دێ.

پێموایە تەنیا بە سەد دۆلار دەکرێ هەندێك رەژیو بۆ منداڵەکانیش پێڵاوو جلوبەرگ بکڕدرێ، کە بتوانن بچنە قوتابخانەو باقی پارەکەش هەل بۆ کچەکە دەڕەخسێنێ کە ئەوەندە خۆی نەڕەتێنێو ئەگەر چەند رۆژێك کاری دەست نەکەوت نیگەران نەبێ.

تۆ دەوڵەمەندترین کەسێکی کە من دەیناسم. داخوا دەتوانی لەسەد دۆلاری خۆت چاپۆشی بکەی؟ ئەم کچە زۆر لە من زیاتر پێویستی بە یارمەتی هەیە. من تەنیا بەخاتری ئەو کچە ئەو داوایەت لێ دەکەم. ئەگینا چارەنووسی دایکەکە زۆر نیگەرانم ناکا. چونکە ئەو خۆی لە قبوولکردنی بەرپرسایەتی دوور خستۆتەوە.

بابەگیان! من لەو کەسانەی دەست لەسەر دەست دادەنیێن و روو لە ئاسمان دەکەن و دەڵێن بە هەموو شتێك رازین، بێزارم. مەگەر شتی وا دەبێ؟ دەست بەردانەوە بۆ چارەنووس، یان هەر ناوێکی دیکەی لەسەر دابنێین، نیشانەی سستی و داماوییە. من مەزهەب و ئایینێکم دەوێ لەوە زیندووترو بەرپەرتر بێ.

بە هەرحاڵ وانەی فەلسەفە گرانتر بووە، دەبێ بۆ سبەینێ هەموو فەلسەفەی "شوبین هاور" لەبەر بکەم. مامۆستای فەلسەفە بیر لەوە ناکاتەوە کە ئێمە بێجگە لە فەلسەفە وانەی دیکەشمان هەیە. مامۆستایەکی بەساڵاچووی جێگای پێکەنینە زۆر جار بێحەواس دەبێ. جاری واش هەیە دەیەوێ گوایە کەلاس شادو زیندوو رابگرێ قسەی بێتام دەگێڕێتەوە. هەرچۆنێ بێ ئێمە زۆر هەوڵ دەدەین کە بزەیەك بکەوێتە سەر لێوانمان، بەڵام بەو خودایە گاڵتەکانی بەتام نین. ئەو لە دوو کاتژمێر وانە گوتنەوەدا لەبارەی "مادە"وە دەدوێ. دەیەوێ بڵێ، ئایا "مادە" لە دەرەوەی زەینی ئێمەدا بوونی هەیە، یان تەنیا شتێکە لە زەینی ئێمەدا. بەڵام ئەگەر لە کچە بەرگدرووەکەی من پرسیار بکەی، پێت دەڵێ کە "مادە" بەڕاستی بوونی هەیە. پێتوایە چیرۆکە نوێیەکەی من ئێستا بەکوێ گەیشتووە؟ لەنێو تەنەکەی کاغەزە بێکەڵکەکاندایە. خۆم پێم وابوو سەرنجڕاکێش نیە. ئەگەر نووسەرێك لەبارەی نووسراوەی خۆیەوە ئاوا بیر بکاتەوە هاوار بۆ بۆچوونی خەڵکی.

ماوەیەك دواتر

لە نەخۆشخانەوە ئەم چەند رستەیەت بۆ دەنووسم. بابە! دوو رۆژە گەرووم هاتووە، چلکی کردووەو لە نەخۆشخانە کەوتووم. تەنیا دەبێ شیری گەرم بخۆمەوە. دوکتور بە سەرسوورمانەوە پرسی:

- بابو دایکی تۆ چۆنیان بیر کردۆتەوە کە بە منداڵی زمانە چکۆلەی تۆیان دەرنەهێناوە؟!

بابەگیان! راستییەکەی خۆیشم نازانم بۆچی؟ قسە لەسەر ئەوەیە داخوا بابو دایکم لەبیری مندا بوون یان نا؟

لەگەڵ خۆشەویستیم

جودی

بەیانیی رۆژی دواتر

ئەم نامەیەم پێش ئەوە بیخەمە پاکەت خوێندەوە نازانم بۆچی پەردەیەکی ئاوەها رەشم بەسەر ژیانمدا کێشاوە. دەمەوێ بڵێم دڵنیابە کە ئێستا گەنجو لەسەر کەیفم. هیوادارم تۆیش هەروا بی. چونکە گەنجێتی پەیوەندی بە ساڵو مانگەوە نیە. پەیوەندی بە دڵەوە هەیەو دەبێ دڵ زیندوو بێ. بابە لەوانەیە سەرو ریشت سپی بووبێ بەڵام تۆ وەك گەنجەکان بیر دەکەیەوە.

لەگەڵ رێزو حورمەت

"جودی"

**١٢ی ژوییه**

**جەنابی مرۆڤدۆستی ئازیز**

ئەو چەکەی ناردبووت بۆ بنەماڵە هەژارەکە، دوێنێ گەیشتە دەستم. زۆر زۆر سپاست دەکەم بابە گیان. نەچومە سەر کەلاسی وەرزش‌و بێ ماتڵی پاش نانی نیوەڕۆ چەکەکەم بۆ بردن. بابە! خۆزیا لەوێ دەبووی‌و سیمای ئەو کچەت دەبینی. سەیرو خۆشحاڵ ببوو. ماق مابوو. لە حاڵێکدا تەنیا ٢٤ ساڵی تەمەنە، بەو هەموو ئەرکەوە کە لەسەر شانیەتی، بەو شێوەیە خەمبار نیە، دەیگوت: خۆشی‌و بەختەوەری یەکجێ روو لە مرۆڤ ناکەن. ئێستا بۆ ماوەی دوو مانگ کاری بەرگدرووئم دەست کەوتووە. کەسێك دەیەوێ مێرد بکاو بۆ دوو مانگ کاری بەرگدروونی هەیە. کاتێك دایکی کچە چەکەکەی دیت‌و زانی کە ئەم کوتە کاغەزە بایی یەکسەد دۆلارە، قیژاندی: خوایە هەزار جار شوکور.

من گوتم:

بابە لاق درێژ ئەو چەکەی ناردووە نەك خوای دلۆڤان (دیارە لەوێ گوتم "بەڕێز ئیسمیت")!

دایك گوتی:

ـ بەڵام خوای دلۆڤان ئەو بیرەی لە دڵی جەنابی ئیسمیت هاوێشتووە.

ـ نا وا نیە. من ئەو بیرە پیرۆزەم خستە دڵی بەڕێز "ئیسمیت"! لە هەرحاڵدا بابە هیوادارم خوای گەورە قەرەبووی ئەو میهرەبانیەی تۆ بکاتەوە. تۆ شیاوی ئەوەی کە لانیکەم دەهەزار ساڵ لە دەرەوەی جەهەنەم ژیان بەسەر بەری.

لەگەڵ یەکدنیا سپاس

"جودی"

## ١٥ی فوریە
## بۆ پیشگای پیرۆزی خاوەنشکۆ پێشکەشە

بەرچایی ئەمڕۆی گیانفیدات بریتی بوو لە گۆشتی ساردی قەلو پونچێکی قاز. پاشان فنجانێك چای چینیم داوا کرد کە پێشتر نەمخواردبۆوە.

بابەگیان! نیگەران نەبی. شێت نەبووم. تەنیا بەشێك لە نووسراوەکانی "ساموئیل پی پیز"[1]ت بۆ دەگێڕمەوە. ئێمە لە مێژووی ئینگلستان کە لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکانەوە وەرگیراوە ئەو مەتڵەبانە دەخوێنین. مەنو "سالی"و "جولیا" ئێستا بە زمانی سالی ١٦٦٠ دەدوێین. سەرنج بدە:

چووم بۆ "چارنیك کراس" کە تماشای لە سێدارەدانی "ماجۆرهاریس" بکەم. "ماجۆر" لەو هەلومەرجەدا شادو دڵ زیندوو دەهاتە بەرچاو.

وە ئەوەی دیکە:

لەگەڵ دڵدارەکەمدا نانی شێومان خوارد. ئەو چونکە دوێنێ براکەی بەهۆی نەخۆشیی گرانەتاوە ئەمری خوای کردبوو، جلی ڕەشی لەبەر کردبوو لەو جلوبەرگەدا زۆر جوان دەهاتە بەرچاو. بابە پێت وا نیە تەنیا یەك ڕۆژ پاش مردنی برا، پەزیرایی لە دڵدارکردن زۆر زوو بێ؟ یەکێك لە هاوڕێیانی پی پیز فێڵێکی بەکار هێنا کە لە فرۆشتنی خواردەمەنی گەنیوو بێکەڵك بە هەژاران، قەرزی حاکم بداتەوە. بۆچوونی تۆ کە کەسێکی لایەنگری چاکسازیت لەم بارەوە

---

(1) Saml Pepys

چیە؟

"سامو‌ئیل" وەکوو کچان جلوبەرگەکانی خۆش دەویستو پێنج ئەوەندەی ژنەکەی پارەی جلوبەرگی دەدا. وا دیارە ئەو کاتە سەردەمی زێرینی مێردەکان بووە.

سەرنج بدە چ پارچە نووسراوەیەکی سەرنجڕاکێشەو چەند بە راشکاوی دەڵێ:

ئەمڕۆ شنیلە ئەتڵەسە جوانەکەم کە دوگمەکانی تەلاییو زۆر گرانم بۆ تەواو بووە، بۆیان هێنامەوە، لە خودا داوا دەکەم بتوانم پارەکەی بدەم.

داوای لێبوردن دەکەم لەوەی کە ئەوەندە ناوی "پی پیز" دێنم. بەهۆی ئەوەیە کە دەمەوێ وتارێك لەبارەی ئەوەوە بنووسم. بابە! بڕیاری نووستن کە لە کاتژمێر دەی شەودا بوو، هەڵوەشاوەتەوەو ئێمە ئەگەر بمانەوێ دەتوانین تا نیوەشەو چراکانمان هەروا رووناك بێ، بە مەرجێك نەبێتە هۆی بێزاریی کەسانی دیکەو خەڵکی زۆریش بۆ ژوورەکانمان بانگهێشت نەکەین. ئاکامی ئەم شتە جوانترین لێکدانەوەیە لەبارەی سروشتی مرۆڤایەتییەوە. واتە ئێستا کە دەتوانین تا هەرکاتێك کە بمانەوێ نەنوین، کاتژمێر ۹ دەست دەکەین بە وەنەوزدانو کاتژمێر ۹:۳۰ پێنووس لە پەنجە بێحاڵەکانمانەوە دەکەوێتە خوارەوە. ئێستا کاتژمێر ۹:۳۰ یە. شەوباش

یەکشەممە

هەر ئێستا لە کلیسا هاتمەوە. وتاربێژی ئەمڕۆی کلیسا خەڵکی جورجیا بوو. وتاربێژ خەڵکی هەرکوێ بێ قەیناکا. خەڵکی ولاتانی یەکگرتوو بێ یان کانادا یان لە چ دەستەو تیرەیەك بێ، هەموو کات وتار بە یەك رێچکەدا دەڕوا، وشكو بێرۆحەو مرۆڤ ماندوو دەکا.

رۆژێکی زۆر جوانه هەموو شوێنێك سەهۆڵبەندانو رووناکە. منو "جولیـا"، "سـالی"، "مـارتی کـین"و ئـەلینور" (هاورێکـانی مـن کـه تـۆ دەیانناسـی) بڕیارمـان داوه تـەنوورەی کـورت لـەپێ کـەینو بـەپێیان بچـین بـۆ مـەزرای "کریستیان ئیسپرینگ"و مریشکی سوورەوەکراو بخۆین. پاشان داوا له جـەنابی "کریستسان ئیسپرینگ" بکەین به فایتوونی خۆی بمانهێنێتەوه بۆ زانکۆ.

بەپێی رێوشوێن دەبێ کاتژمێر ۷ له زانکۆ بین، بـەڵام ئێمـه خـەیاڵمان وایـه هەندێك کاتەکەمان درێژ بکەینەوەو کاتژمێر ۸ بگەینەوه زانکۆ.

بـەدوعا بـەڕێزی میهرەبـان. شـانازی بـەوه دەکـەم کـه ئـەرکناس، بـەوەفاوو گوێڕایەڵی تۆم.

ـ ج ئابۆت"

**٥ی مارس**

**جەنابی یارمەتیدەری ئازیز**

سبەینێ یەکەمین چوارشەممەی مانگە. بۆ رێکخراوی "جان گریر"، رۆژێکی ناخۆشە. کاتێك کاتژمێری پێنج رادەگەیەنن هەموو پشوویەکی ئارام دەدەن و ئێوە دەستێکی نەوازش بەسەری منداڵەکان دا دێنن و دەڕۆن.

بابە تۆ هەرگیز دەستی لاواندنەوەت بەسەر مندا هێناوە؟ پێموانیە. چونکە ئەوەی لەبیرمە هەموو کات لە لایەن یارمەتیدەرە زگ زلەکانەوە سەبارەت بە من ئەو کارە کراوە. هەر کاتێك بیر لە رابووردووی دوورو تەماویی خۆم دەکەمەوە هەست و سۆزم سەبارەت بە رێکخراوی "جان گریر" پڕ دەبێ لە خۆشەویستی. کە هاتمە زانکۆ رق و تووڕەییەکی تایبەتیم بۆ ئەو رێکخراوە هەبوو. وام بیر دەکردەوە کە لە هەموو خۆشییەکانی ژیان بێبەش بووم و هەموو ئەوانەی کە کچانی دیکە هەیانە، بە شێوەیەکی بێبەزەییانە لێم داگیر کراوە. بەڵام ئێستا بە هیچ کلۆجێ ئەو هەستەم نیە. بەڵکوو رابووردوو بە شتێکی ئاسایی دەزانم و هەروەها بە دەستپێکێکی باش بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی ژیانەوە دەزانم. من ئێستا بە چاوێك لە دوورەدیمەنی ژیان دەڕوانم. کچانی دیکە لە شوێن و جێگایەکی باش و شیاودا گەورە بوون، وای نابینن. زۆر لە کچەکان (بۆ نموونە "جولیا") نازانن بەڕاستی بەختەوەرو کامەرانن. ئەوان ئەوەندە لەگەڵ خۆشییەکان تێکەڵاو بوون کە هەست و سۆزیان ئیفلج بووە. بەڵام من هەموو لەحزەیەك بەختەوەریی خۆم هەست پێدەکەم، بێگومانم کە بەختەوەرم و هەر رووداوێکی خراپیش بێتە

پێش، لەسەر ئەو بڕوایەی خۆم دەمێنمەوەو لەگەڵ پێشهاتەکان (ئەگەر ددان ئێشەش بێ) وەك ئەزموونێکی نوێ لێی دەڕوانم. لەوەی کە لە هیچ ئەزموونێکی نوێ غافڵ نەبووم، خۆشحاڵم. ئێستا دەستی چارەنووس هەر جۆرێك یاری بکا منیش هەر بەو شێوەیە لەگەڵی یاری دەکەمو ئامادەی هەر چەشنە چارەنووسێکم.

لە هەرحاڵدا بابەگیان! ئەم خۆشەویستییە نوێیەی من بۆ هەتیوخانەی "جان گریر" زۆر بە جیددی مەگرە. ئەگەر تەنانەت وەك "ڕۆسۆ"[1] پێنج منداڵیشم هەبێ ئامادە نیم تاکە یەکێکیان لەسەر پلەکانەکانی هەتیوخانە دابنێم.

شیاوترین سڵاوی من بە خاتوو "لیپت رابگەیەنە (سڵاوو ڕێزلێنان وشەیەکە کە لە جێگای خۆیدایە. چونکە ئەگەر بڵێم خۆشەویستی، دوورە لە ڕاستی). بابەگیان لەبیرت نەچێ بە خاتوو "لیپت" بفەرموو کە من ئێستا چ جۆرە کەسایەتییەکم.

لەگەڵ ڕێزم

جودی

---

[1] Roussu

لاك ڤیلو

٤ی ئاوریل

بابەی خۆشەویست

تماشای مۆری پۆستخانە بکەو بزانە ئەم نامەیەم لە کوێوە بۆ نووسیوی. منو سالی لە پشووی جێژنی پاك دا، بە چوونمان بۆ "لاك ویلو" ئەو شوێنەمان نوقمی شادی کرد. بریارمان دابوو بۆ ماوەی دەرۆژ بین بۆ "لاك ویلو" کە جێگایەکی ئارامو بێدەنگو هەرایە. ئێمە ئەوەندە هیلاكو ماندوو بووین کە ئیدی خواردەمەنیی "فرگۆسن" لە گەروومان نەدەچووە خوارەوە.

بۆ کەسێکی ماندوو شەکەت نان خواردن لەگەڵ چوارسەد کچ لە هۆڵێکدا کارێکی دژوارە. بەهۆی غەڵبەو هەراوە مرۆڤ دەنگی کچی پەنا دەستی نابیستێ. بروا بفەرموو بابە! مەگەر هەردوو دەستمان بەلای دەمانەوە گرتباو هاوارمان کردبا جا لە یەك حاڵی باین.

لێرە دەچینە سەر تەپۆڵکەکان دەخوێنینەوە، دەنووسینو دەحەسێینەوە. زۆر خۆشمان لێرادەبرێ.

ئەمرۆچووینە سەر لووتکەی "تەپکی ئاسمان" راست ئەو شوێنەی لەگەڵ بەرێز "جروی" چووینو ژەمی شێومان ساز کردو خواردمان. مرۆڤ بروا ناکا کە ئەوە دوو ساڵی بەسەردا تێپەڕ بووە. لەو شوێنەی کە ئاگرمان کردەوە، هێشتا بەردە دووکەڵ گرتووەکان لەوێ کەوتبوون. زۆر سەیرە ئینسان لە هەندێ شوێندا کەسانی دیکەی وەبیر دێتەوە. بۆ ماوەی دوو خولەك "جروی"م وەبیر هاتەوە بێ ئەو هەستم بە تەنیایی دەکرد.

نازانم لە چالاکییەکانم هەواڵت پێگەیشتووە یان نا؟ ڕەنگە وا بیر بکەیەوە کە قەت چاك نابم!

ئێستە خەریکم کتێبێکی نوێ دەنووسم. سێ حەوتوو لەمەپێش دەستم پێکردووەو بە ڕەمزو رازی کارەکە شارەزا بووم. بەڕێز "جروی"و دەزگای بڵاوکەرەوە باشی بۆ چوون. مرۆڤ کاتێك لەبارەی شتێکەوە کە بە باشی لێ ئاگادارە بدوێ یان بنووسی، دەتوانێ قسەی خۆی بە کەسانی دیکە بسەلمێنێ‌و شوێنی خۆی دابنێ. ئەمجارە لەبارەی شتێکەوە دەنووسم کە بە تەواوی لێی ئاگادارم. دەتوانی بیری لێ بکەیەوە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ؟ لە هەتیوخانەی "جان گریر"ـەوە. بابەگیان بەڕاستی پێموایە زۆر باشم دەست پێ کردووە. شتەکە لەبارەی ئەو ڕووداوە بچووکانەوەیە کە هەموو ڕۆژێك لەوێ روو دەدەن. من وازم لە ڕۆمانتیسم هێناوەو ئێستا "ریئالیست"م، ئەگەرچی دواتر، کاتێك داهاتووی پڕ لە ڕووداوی من دەست پێ دەکا، دیسانەوە دەگەڕێمەوە بۆ ڕۆمانتیسم.

دڵنیام کە ئەم کتێبە زوو تەواو دەبێ، چاپ دەکرێ‌و بڵاو دەبێتەوە. ئەبینی.

ئەگەر مرۆڤ شتێکی بە هەموو هێزو توانای خۆیەوە گەرەك بێ‌و لە ئەنجامدانیدا تێبکۆشێ، بێگومان سەردەکەوێ. چوار ساڵە بەهیوام نامەیەکم لە تۆوە پێ بگاو هێشتا نائومید نەبووم.

خوات لەگەڵ بابەی ئازیز. پێم خۆشە بە بابەی ئازیز ناوت بەرم.

لەگەڵ خۆشەویستی هەتا هەتایی

جودی

پەراوێز

لەبیرم چوو هەواڵی ئەم ئیلاخەت بۆ بنووسم. دیارە هەواڵەکان خۆش نین.

ئەگەر دەزانی پێی جارز دەبی ئەم پەراوێزە مەخوێنەوە.

"کرۆ"ی پیری چاورەش مردووە. دەڵێن ئەوەندە پیر ببوو نەیدەتوانی بلەوەڕێ. ناچار بوون بە گوللەی چەك بیکوژن. مشکە کوێرە یان راسۆ، حەوت لە جوجکەکانی خواردووە. یەکێك لە گاکان نەخۆشەو ئێمە چوین لەشارۆچکەوە دوکتوری ئاژەڵمان بۆ هێنا. "ئاماس" تەواوی شەو نەنووست بۆ ئەوە ویسکی‌و رۆنی پەمو بدا بە گاکە. وا دەردەکەوێ گای بەستەزمان تەنیا رۆنی پەمووی پێدراوە. پشیلە تووکنەکە ون بووە، دەترسێم بە تەڵەوە بووبێ. ئەم دنیایە پڕە لە نیگەرانی.

**١٧ی مانگی مەی**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

ئەم نامەیە زۆر کورت دەبێ. تەنانەت کاغەزو پێنووس دەبینم شانەکانم دێشن. تەواوی ڕۆژ نووسینو دیسان نووسین زۆر سەختە.

جێژنی، کۆتایی سالّی دەرس خوێندن سێ حەوتوو پاش چوارشەممەی داهاتوو دەست پێ دەکا. وا باشە ئەو ڕۆژە تۆ لێرە بی تا لە نزیکەوە لەگەڵ یەک ئاشنا بین. ئەگەر نەیەیت دڵگران دەبم.

"جولیا" لە بەرێز "جروی" گێڕاوەتەوە. لەگەڵ یەکتر خزمایەتییان هەیە. "سالی" "جیمی" دەعوەت کردووە. کەوابوو من کێ بانگهێشت بکەم؟ تەنیا تۆی‌و خاتوو "لیپت". پێمخۆش نیە خاتوو "لیپت" دەعوەت بکەم. تکات لێ دەکەم تۆ تەشریف بێنە. لەگەڵ یەکدنیا خۆشەویستی. لە حالێکدا هەموو ئەنگوستەکانم بەهۆی نووسینی زۆرەوە دێشن.

"جودی"

**١٩ی مانگی ژوئەن**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

دەرس خوێنـدنی مـن کۆتـایی پـێ هـات و شـەهادەکەم لەگـەڵ دوو دەسـت جلوبەرگی نوێ لە کەشەوی خوارووی مێزەکەمدا دانراوە.

جێژنی کۆتایی دەرس خوێندن وەك هەموو جاران بەڕێوە چوو. زۆرت سـپاس دەکەم بۆ ئەو گوڵانەی کە بۆت ناردبووم.

بەڕێزان "جروی"و "جیمـی"ش گوڵیـان بـۆ نـاردبووم. گوڵـەکانی ئـەوانم لـە گەرماوەکە دانا. بەڵام گوڵەکانی تۆم لەکاتی سان و ڕێژەدا بەدەستەوە بوو.

هاوینی ئەمساڵ لە "لاك ویلو" دەبم. لەوانەیە بـۆ هەمیشـە لـەوێ بمێنمـەوە. لەوێ خواردەمەنی هەرزانە. دیمەنی "لاك ویلـو" بـۆ کەسـێکی نووسـەر جوان و ئیلهام بەخشە. نووسەرێکی تازەکار لەوە زیاتر چی دەوێ؟

من عاشقی کتێبم. هەموو لەحزەیەك لەیادم دایە. شـەوان خـەو بـە کتێبـەوە دەبینم. تەنیا ئاواتم دەوروبەرێکی ئارام و بێدەنگ و کاتی زۆرە کـە بتـوانم لەسـەر کتێبەکانم کار بکـەم (دیـارە خواردەمـەنیی خـۆش و وزەبەخشیشـیم لەگـەڵ کـار خۆش دەوێ).

بەڕێز "جروی" مـانگی ئووت بـۆ یـەك حـەوتوو دێت بـۆ ئێـرە. "جیمـی"ش هەرکات بۆی کرا سەرێك لە "لاك ویلو" هەڵدێنێ. "جیمـی" لـە کومپانیایـەك

کار دەکا. دەچێتە شارۆچکەو گوندەکان کە "پشك"[1] (سەهم)ی وەرزێرەکان بە بانکەکان بفرۆشێ. کەوابوو کاتێك بێتە ئێرە سەردانێکی ئێمەش دەکا.

بابە! دەبینی "لاك ویلو" زۆریش خەڵوەت نیە. هەموو کات چاوەڕێم رۆژێك تۆش بە ماشین بێی بۆ ئێرە.

بەڵام دەزانم خواستێکی بێجێیە. کاتێك بۆ جێژنی کۆتایی دەرس خوێندنم نەهاتی خەیاڵی هاتنت بۆ ئێرەم لە مێشکم دا سڕییەوە.

جودی ئابۆتی

لیسانسە

[1] پشك یان سەهم لە فارسی‌دا بە بەرگەی رەسیدی بڕێك لە دەستمایەی کارگەیەك یان شەریکەیەك دەڵێن‌و بەو شەریکەش دەڵێن: شرکت سهامی

**١٤ای مانگی ژووییه**

**بابه لاق درێژی ئازیز**

ئایا تۆ له کارکردن چێژ وەردەگری؟ لەوانەیە قەت کارت نەکردبێ تا بزانی ئەو کارە بۆ مرۆڤ بەتام‌و خۆشە، کە مەیلی لەسەریەتی‌و لە سەرەوەی هەموو کارەکانی دیکەی دەزانێ. هەموو هاوین بە پەلەو بێ‌پراوەستان کارم دەکرد. نووسیم. بەلاّم هێشتا بەداخەوەم بۆچی رۆژەکان درێژتر نین کە بتوانم بیروخەیالە باش‌و بە بایەخەکانی خۆم زیاتر بهێنمە سەر کاغەز.

فەسلّی دوویەم لە کتێبەکەم تەواو کردووەو سبەینێ کاتژمێر ٧:٣٠ خولەك دەست بە نووسینی فەسلّی سێیەم دەکەم. باوەڕت بێ شیرینترین‌و جێگای سەرنجترین کتێبێکە کە بە درێژایی تەمەنت خوێندبێتتەوە. بەدایم بیرم لای کتێبەکەیە. تەنانەت دلّم نایە بەیانیان جل لەبەر کەم‌و بچم بۆ خواردنی بەرچایی، هەمیشە خەریکی نووسینم. دەنووسم. دەنووسم‌و دەنووسم تا ئەو کاتەی هەست دەکەم لە شەکەتی‌دا هەناسەم بۆ نادرێ. ئەمجار "کالین"ی (سپلۆتی لای ران[1]) بانگ دەکەم‌و لەگەلّ ئەو لەنێو مەزراکاندا پیاسە دەکەم. هەوای خاوێن هەلّدەمژم‌و مەتلّەبەکان لەسەرمدا بۆ سبەینێ ئامادە دەکەم.

بابە سوێند دەخۆم ئەمە جێگای سەرنجترین کتێبێك دەبێ کە لە درێژەی

---

[1] ران ـ رانەمەڕ

تەمەنتدا خوێندبێتەوە (ئای ببوورە پێشتر ئەم رستەیەم نووسیبوو).

بابە گیان! پێت وا نەبێ کەسێکی لەخۆڕازیم کە ئەمانەت بۆ دەنووسم. سوێند دەخۆم‌و دڵنیام کە وا نیە. ئێستا دەمەوێ کتێبێکی راستەقینە بنووسم. جا دەبینی.

کەمێك لێم راوەستە با لەبارەی شتەکانی دیکەوە بۆت بنووسم. ئەرێ بۆم نووسیبووی کە "ئاماس"و "کاری" مانگی رابووردوو زەماوەندیان کرد؟ ئەوان هێشتا هەر لێرە کار دەکەن. بەڵام هەردوویان هەندێك گۆڕاون. پێشتر ئەگەر "ئاماس" بە پێوپلی قووڕاویەوە دەهاتە ژوور، یان خۆڵەمێشی دەڕژاندە سەر زەوی، کاری قاقا پێی پێدەکەنی. لە لایەکی دی "ئاماس" کە جاران حازر بە خزمەت‌و میهرەبان بوو، داری دەهێناو رایەخی دەتەکاند، ئەگەر ئێستا لەو جۆرە کارانەی پێ بسپێردرێ روو تاڵ دەکاو دەست دەکا بە بۆڵە بۆڵ. ئێستا کراواتی بەرەنگی مات، قاوەیی یان رەش دەبەستێ. وا دەردەکەوێ هاوسەرگیریی لەباتیی ئەوە مرۆڤ بەرەو باشی ببا، بەرەو خراپی دەبا، ئەگەر وابێ لەوانەیە قەت شوو نەکەم. واباشتر بوو ئەم جووتەش قەت زەماوەندیان نەکردبا. هەواڵێکی تازەم لەبارەی ئەم کوێستانەوە پێ نیە. تاژەڵەکان هەموو ساخ‌و سڵامەتن. بەرازەکان زۆر قەڵەو بوون. گاکانیش رازی دێنە بەرچاو. مامرەکان باش هێلکە دەکەن. داخوا تۆ کاری بەخێوکردنی مریشکت پێ خۆشە؟ ئەگەر پێت خۆشە رێگام بدە نهێنی ئەوەت پێ بڵێم کە چۆن مریشکێك بتوانێ لە ساڵێکدا دووسەد هێلکە بکا". دەمەوێ ساڵی داهاتوو بەپێی سیستەمی نوێ مریشك بەخێو بکەم دەبینی چۆن دەمەوێ بۆ هەمیشە لە "لاك ویلو" نیشتەجێ بم.

بڕیارم داوە ئەوەندە لێرە بمێنمەوە تا وەك دایکی "ئانتونی ترولوپ"[1] ١١٤ کورتە چیرۆك بنووسم. دوای تەواوبوونی ئەو کارەم، دەتوانم پاشماوەی ژیانم بە گەشتو گەڕان لەم جیهانەدا رابوێرم.

بەڕێز "ج مەك براید" یەکشەممەی رابووردوو لای ئێمە بوو بۆ ژەمی شێو کەبابی مریشكو بستەنیمان خوارد. هەردووی ئەوانەی پێ خۆش بوو. بەڕاستی بە دیتنی خۆشحاڵ بووم. دیداری ئەو منی هێنایە سەر ئەو رایە کە جیهان چەندە گەورەو خۆشە. "جیمی"ی بێوڵەت هێشتا گرفتاری سەنەدو وەرەقەی پشکەکانە. پێوایە ئاخریەکەی بگەڕێتەوە بۆ "ویستر"و لە کارگەکەی باییدا کارێك بگرێتە دەست. "جیمی" دڵساف‌و کار درووستتر لەوە کە بتوانێ ئەهلی معاملە بێ. بەڵام زۆر میهرەبانو لەکاردا ماندوویی نەناسە. بێگومان لەوێ سەرکەوتوو دەبێ. ئەگەر بتوانێ بەرپرسایەتیی بەشێك لە کارگەکەی بابی بگرێتە دەست، ئەوە کارێکی ئابڕومەندانەیە. تۆش پێت وا نیە؟ ئەوە بۆچوونی لەبارەی هەموو شتێکەوە گۆڕدراوە بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەهلی هەوڵو تێکۆشانە.کارگەی بابی "جیمی" جلوبەرگی کار چێ دەکا. "جیمی" بە چاوێکی سووك تماشای جلوبەرگی کار دەکا، بەڵام رۆژێك دێ کە ئەو بۆچوونەش بگۆڕدرێت.

هیوادارم لەوەی کە بەم پەنجە ماندوو ئێشاوانەوە، ئەم نامە دوورو درێژەت بۆ دەنووسم قەدرم بزانی. دیمەنی جوانی دەوروبەر، خواردەمەنیی زۆرو بەتام، جێگاو بانێکی نەرم، یەك دەستە کاغەزو شیشەیەك جەوهەرکە لەبەردەستم دایە، لەمە زیاتر چیم لەم جیهانە دەوێ.

ئیرادەتمەندی هەتا هەتاییت

---

[1] Anthony Trollope

جودی

پەراوێزی نامە

پۆستەچی هەر ئێستا هات بۆ ئێرە بە چەند هەواڵی تازەوە، هەینی داهاتوو جەنابی "جروی" بۆ یەك حەوتوو دێ بۆ "لاك ویلو" هەواڵێكی خۆشە. بەڵام دەترسێم بۆ كتێبە چارە رەشەكەی من زیانی هەبێ. چونكو بەرێز "جروی" زۆر سەختگیرە.

**٢٨ی ئووت**

**بابە لاق درێژی ئازیز**

تۆ لەکوێی؟

قەت نازانم لە کام شوێنی ئەم جیهانەدای. بەڵام هیوادارم لەم هەوا ناخۆشەدا لە نیویورك نەبی. هیوادارم لەسەر ترۆپکی چیایەك بی (بەڵام نەك لە سویس. ئەوێ زۆر دوورە. لە جێگایەکی نزیکتر). تماشای بەفر بکەی‌و لەیادی مندا بی. تکات لێ دەکەم بیر لە من بکەیەوە. "سالی" دەیەوێ سالی دادێ بچێ بۆ "بۆستۆن"و لەوێ بمێنێتەوەو کارێك پەیدا بکا. پێت وا نیە بۆ منیش باش بێ لەگەڵی برۆم؟ لەوێ ئێمە دەتوانین پێکەوە بژین‌و کار بکەین. کاتێ ئەو لەسەر کار دەبێ، من دەتوانم بە کاری نوسینەوە خەریك بم‌و پاش نیوەڕۆکانیش دەتوانین پێکەوە بین.

کاتێك بێجگە لە "سمپل"ـەکان‌و "کاری"و "ئاماس" کەسێکی دیکە نەبێ کە لەگەڵت قسە بکا، شەوانی ئێرە زۆر درێژ دێنە بەرچاو. من هەر لەپێشدا دەزانم دژایەتیی چوونم لەگەڵ "سالی" دەکەی‌و دەتوانم هەست بەوە بکەم کە سکرتێرەکەت چیم بۆ دەنووسێ:

"خاتوو جیرۆشا ئابۆت"

خاتوونی ئازیز

بەرێز "ئیسمیت" وای پێ باشە کە تۆ لە "لاك ویلو" بمێنیەوە. بە سپاسەوە "ئەلمر گریگز"

من رقم لەو سکرتێرەی تۆیە. بێگومانم کەسێك ناوی ئەلرگریکز بێ دەبێ کابرایەکی ناشیرینو دزێو بێ. بەڵام بابە! وێدەچێ ناچار بم بچم بۆ بۆستون. چونکە ناتوانم لێرە بمێنمەوە. ئەگەر دەرووبەکم لێنەکرێتەوە، لە نائومێدیدا بەڵایەك بەسەر خۆمدا دێنم.

هاوار! چەندە گەرمە. هەموو سەوزاییەکان لە گەرمان سووتان جۆگا ئاوەکان وشك بوونو رێگاکان پڕن لە تۆزو خۆڵ. چەند حەوتوویەکە باران نەباریوە. هەر کەس ئەم نامە بخوێنێتەوە وا دەزانێ من شێت بووم. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە من پێویستم بە بنەماڵەیە.

خوات لەگەڵ بابەی زۆر خۆشەویستم

ئارەزوومە بتبینم

"جودی"

"لاك ویلو"

١٩ی سێپتامبر

بابەگیان! ئاستەنگێکم بۆ هاتۆتە پێش کە نیازم بە یارمەتیی فکریی تۆیە. دەمەوێ تۆ ئامۆژگاریم بکەی؟ ئەو ئامۆژگارییەم لەم جیهانەدا تەنیا لە تۆ دەوێ و بەس.

داخوا دەکرێ بتبینم. وا باشترە پێکەوە قسە بکەین تا ئەوە بەهۆی نامەوە لەگەڵت بدوێم. بێجگە لەوەش دەترسێم سکرتێرەکەت نامە بکاتەوە.

جودی

پەراوێز:

من زۆر دڵتەنگ و زوێرم.

## "لاك ويلو"

## ٣ی مانگی ئۆکتۆبر

بابە لاق درێژی ئازیز

ئەو یادداشتەی کە بە دەستوخەتی خۆت نووسیبووت‌و تا رادەیەك دیار بوو بە دەستێکی لەرزۆك نووسراوە، ئەم بەیانییە گەیشتە دەستم لەوەی کە ناساخ بووی زورم پێ ناخۆش بوو. ئەگەر بمزانیبا ناساخی بە نووسینی گیروگرفتەکانی ژیانی خۆم زەحمەتم نەدەدای. بەڵام ئێستا کە خۆت ویستووتە ئاستەنگەکانی خۆمت بۆ دەنووسم. شتەکە ئاڵۆزو زۆر زۆر نهێنییە. تکات لێ دەکەم پاش خوێندنەوە، ئەم نامەیە بسووتێنە. پێش ئەوەی دەست بە نووسینی ئاستەنگەکەی خۆم بکەم، ویستم بڵێم کە چەکێکی هەزار دۆلاریم لەگەڵ ئەم نامەیە ناردە خزمەتت. جێی پێکەنینە کە من چەك بۆ تۆ بنێرم. وا نیە؟ پێت وایە ئەم پارە لە کوێوە هاتووە؟

بابە گیان! چیرۆکەکەم فرۆشت. لە حەوت بەشدا چاپ‌و بڵاو دەکرێتەوەو پاشان دەبێ بە کتێبێك. رەنگە وا بیر بکەیتەوە کە لە خۆشیان لە پێستی خۆمدا ناگونجێم. بەڵام قەت وا نیە. بە تەواوی ئاسایی‌و ئارامم. ئیتر لەوەی کە وردە وردە دەتوانم قەرزەکان بدەمەوە زۆر خۆشحاڵم. من زیاتر لە دوو هەزار دۆلار قەرزداری تۆم کە لە درێژایی ئەم چەند ساڵەدا گەیشتووە بەوەندە. تکات لێ دەکەم لەبارەی ناردنی ئەو چەکەوە دڵگران نەبی.

من بێجگە لە پارە هەزار جۆر قەزری تۆم لەسەر شانە کە دەبێ بە درێژی

تەمەنم بە سپاس و پێزانینەوە پێتی بدەمەوە.

باشە بابە گیان! با بچینە سەر کێشەکەی من. تکات لێ دەکەم بەو ئەزموونەی کە هەتە ڕێنوێنیم بکە، بیریش لەوە مەکەوە کە ڕێنوێنیەکانتم پێ خۆش دەبێ یان پێم ناخۆش دەبێ.

دەزانی من هەمیشە چ خۆشەویستی و بڕوایەکم بە تۆ بووە. تۆ وەك نوێنەرو جێنشینی هەموو بنەماڵەی منی.

بابەگیان! پێت ناخۆش نەبێ کە من هەستێکی قووڵترم سەبارەت بە پیاوێکی دیکە هەیەو لەوەی کە ماوەیەکە نامەکانم پڕن لە ناوبردنی بەڕێز "جروی"، دەتوانی بێ ئەوی زەحمەتێکی زۆر بەخۆت بدەی بزانی کە ئەو پیاوە کێیە.

خۆزگە دەمتوانی بەڕێز "جروی"ت بۆ وەسف بکەم. بابەگیان نازانی چەندە پێکەوە هاوڕێ و تەبایین و سەلیقەو بۆچوونمان چەندە وەك یەکەو چۆن یەك بیر دەکەینەوە. من زۆر جار تێدەکۆشم تاکوو بەسەر مەیل و ئارەزووەکانی ئەودا زاڵ بم و ئەو بەهێند نەگرم. بەڵام هەموو کات حەق بەوەو ئەو درووست بیر دەکاتەوە. دەبێ هەرواش بێ چونکی چواردەساڵ لەمن گەورەترە. بەڵام لە هێندێ باریشەوە منداڵێکی گەورە بەحیساب دێ کە دەبێ هۆشت پێوەی بێ. بۆ نموونە کاتێك باران دەبارێ لەبیری نیە کە دەبێ خۆی لە سەرما بپارێزێ، بەڵام من و ئەو لەبارەی زۆربەی شتەکانەوە وەك یەك بیر دەکەینەوە. زۆر جار رووی داوە لە بیستن یان لە دیتنی شتە سەیرو سەمەرەکانیشدا وەك یەك لێیان تێدەگەین و پێیان پێدەکەنین. راوبۆچوونی دوو کەس لێك دوور بن زۆر ناخۆشە، بەڵام چووکەترین جیاوازیی بیرکردنەوەیەك لە نێوان من و ئەودا نیە.

خوایە ... نازانم چی بڵێم. هەرچۆنێك بێ ئەو، ئەوەو منیش دڵم بۆی لێ دەداو جیهانی بێ‌ئەو بۆ من بەتاڵ و پڕ لە ئازارە. ئێستا لە مانگەشەو بێزارم چونکە

بەڕێز "جروی" لێرە نیە کە پێکەوە تماشای ئەو هەموو جوانییەی مانگەشەو بکەین. لەوانەیە تۆش عاشق بوویبی‌و بزانی چی دەڵێم. ئەگەر عاشق بوویی پێویست ناکا من لەبارەیەوە بدوێم. ئەگەریش عاشق نەبوویی، ناتوانم ئەو شتەت بۆ شی بکەمەوە.

لە هەرحاڵدا ئەوەیە هەست‌و سۆزی من سەبارەت بە بەڕێز "جروی". کەچی لەگەڵ ئەوەش پێشنیاری هاوسەری‌و ژیانی هاوبەشی ئەوم ڕەت کردۆتەوە.

من پێم نەگوت بۆچی نامەوێ پەیمانی هاوسەریی لەگەڵ ببەستم. گێژو لاڵ ببووم. هەرچەندەم بیر لێ دەکردەوە نەمدەزانی چی پێ بڵێم. ئەو ئێستا ئێرەی بەجێ هێشتووەو وا دەزانێ دەمەوێ لەگەڵ "جیمی مەك براید" پەیمانی هاوسەری ببەستم. لە حاڵێکدا من هیچکات ئەوم بەبیردا نایە. پێموایە "جیمی" هێشتا منداڵە. بەهەرحاڵ لە نێوان من‌و بەڕێز "جروی"دا جۆرێك لێك تێنەگەیشتن پێك هاتووەو هەست‌و سۆزی یەکترمان بریندار کردووە.

هۆی ئەوە کە من ئەوم لە خۆم دوور خستەوە، ئەوە نیە کە خۆشم ناوێ، بەڵکوو بە هەموو وجوودمەوە خۆشم دەوێ. پێشنیارەکەیم بۆیە قبووڵ نەکرد چونکوو دەترسام لە داهاتوودا پەشیمان ببێتەوەو من بەرگەی ئەوەم نەدەگرت. پێم درووست نەبوو کەسێکی لەو پلەو پایەی بنەماڵەییەدا لەگەڵ کەسێك کە کەس نازانێ باو باپیری کێن، هاوژین بێ. لەبارەی هەتیوخانەوە هیچم پێ نەگوتووەو لەوەی کە بڵێم کێم‌و لە کوێوە هاتووم بێزارم. لەوانەیە کەسێکی خراپ بم. لە هەرحاڵدا بنەماڵەی ئەو زۆر زۆر بەدەعیەن‌و منیش خۆم لە کەس بە کەمتر نازانم.

بێجگە لەوەش هەستم کرد سەبارەت بە تۆ ئەرکێکم لەسەر شانە. هەرچۆنێك بێ من دەرسم خوێندووە کە ببم بە نووسەرو دەبێ هەوڵ بدەم بەپێی ئەو قەول‌و

پەیمانە بجوولێمەوە. دوور لە ئینسافە ئەو دەرس خوێندنە قبوولْ بکەمو لە دوایی‌دا خۆمی لێ بدزمەوەو کەڵکی لێ وەرنەگرم. بەڵام ئێستا کە دەتوانم ئەو پارەی کە لە ڕێگای پێگەیاندنی مندا خەرجت کردووە پێت بدەمەوە، هەست بەوە دەکەم، کە لەوانەیە ئەرکم سووکتر بووبێ. بێجگە لەوە پێموایە ئەگەر مێردیش بکەم، دیسان دەتوانم بە کاری نووسین درێژە بدەم. ئەو دوو شتە بەرگێڕەوەی یەکتر نین.

زۆرم بیر لێ کردۆتەوە. دیارە چونکو بەڕێز "جروی" سوسیالیستە، وەك کەسانی دیکە بیر ناکاتەوەو دەتوانێ لەگەڵ "پرولتێر"ێك پەیمانی هاوسەری ببەستێ. ڕەنگە دوو کەس کە لەگەڵ یەك تەبان‌و لە کەناری یەکتردا بەختەوەرن، ئەگەر لە یەکتر جیا ببنەوە هەست بە تەنیایی بکەن، نابێ ڕێگا بدەن هیچ شتێك ببێ بەهۆی جیابوونەوەیان. هەرچۆنێك بێ دەمەوێ ئەو فەلسەفەیە بەخۆم بسەلمێنم. ئێستا لە ناخی دڵەوە دەمەوێ بۆچوونی ڕاست‌و بێلایەنگرانەی تۆش ببیستم. دیارە تۆش لە خانەدانەکانی‌و دەتوانی لەم بارەوە وەك کەسێکی بەئەزموون‌و دنیا دیتوو تێی بفکری، بەڵام نەك لە ڕێگای دڵسۆزی‌و هاودەردی‌یەوە. دەبینی چۆن بەرپەری بوێرییەوە ڕاستییەکانت بۆ شی دەکەمەوە؟

وای دابنێین بچم بۆ لای بەڕێز "جروی"و پێی بڵێم کە هۆی وەڵامی نەرێنیی من بوونی برای سالی نیە، بەڵکوو هەتیوخانەی "جان گریر"ە، پێت وایە کارێکی خراپ بێ؟ دیارە ئەو کارە ئازایەتییەکی زۆری دەوێ. ئەگەر بە درێژایی تەمەنم چارەڕەش بم، پێم ئاسانترە لەوەی بچم ئەوە بە بەڕێز "جروی" بڵێم.

ئەم کێشەیە نزیکەی دوو مانگ لەمەپێش ڕووی داو لەو کاتەوە کە بەڕێز "جروی" لێیداو ڕۆشت چووکترین هەواڵم لێی نەبوو. خەریك بووم نائومێد دەبووم کە لەنەکاو نامەی "جولیا"م پێ گەیشت‌و ئەو نامەیە ڕایچڵەکاندم. ئەو

نووسیبووی که کارەکان خەریکن رێك‌و پێك دەبن‌و هەروەها ئامـاژەی بـەوەش کردبوو که مامه "جروی" کاتێك بۆ راوکردن چوو بووە کانادا تووشی سـەرماو کرێوە بووەو لەو کاتەوە تا ئێستا ناساخەو سینەپالّووی گرتووه. مـن بـەم شـتەم نەدەزانی. زۆر نیگەران بووم. چونکە لەو کاتەوە ئـەو رۆیشـتبوو هـیچ هـەوالێکم لێی نەبوو. بەلاّم هەستم دەکرد وەك چۆن من خەمنـاکم ئەویش وەك من له رەنـج دایه. ئێستا پێت وایه من دەبێ چی بکەم؟

"جودی"

**٦ی مانگی ئۆکتۆبر**

**بابە لاق درێژی ئازیزم**

بەڵێ بەسەر چاو. کاتژمێر چوارو سی خولەکی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممە دێمە خزمەتت. دیارە دەتوانم ڕێگاکە بدۆزمەوە. من سێ جار چوومە نیویورک‌و ئێستاش ئیدی منداڵ نیم. ناتوانم بڕوا بکەم کە بەڕاستی دەتبینم. تۆ تا ئێستا بۆ من نوورو ڕووناکی‌و کەسێکی خێرخواز بووی. بڕوا ناکەم کە لەگەڵت ڕووبەڕوو دەبم. ئەوەندەم بیر لە تۆ کردۆتەوە کە ناتوانم بڕوا بکەم تۆش وەك ئێمە لە پێست‌و ئێسك‌و خوێنی‌و دەکرێ بەدەست لێدان هەستت پێ بکرێ.

بابە تۆ مرۆڤێکی لەرادەبەدەر باشی کە بەخاتری من خۆت دەخەیە زەحمەت، ئەویش لە حاڵێکدا کە ناساخی‌و لاوازیش بووی. ئاگات لە خۆت بێ سەرما لێت نەدا. هەوای پاییز مەترسی دارە.

لەگەڵ جیهانێك خۆشەویستی

جودی

پەراوێز: شتێك بە بیرمدا هات کە بێزارم دەکا، ئەویش ئەوەیە کە تۆ خزمەتکارت هەیە. من لەو خزمەتکارانە دەترسێم ئەگەر یەکێك لەوانە دەرکەم لێ بکاتەوە هەرلەوێدا لەسەرخۆ دەچم. نازانم چی پێ بڵێم؟ تۆ کە ناوی خۆت پێ نەگوتووم. دەکرێ بڵێم دەمەوێ جەنابی "ئیسمیت" ببینم؟

## بەیانیی ڕۆژی شەممە

بەڕێز جەنابی جروی ـ بابە لاق درێژ ـ پندلتون ـ ئیسمیتی زۆر ئازیز

دوێشەو شەو نووستی؟ من خەوم لێ نەکەوت. تەنانەت برژانگەکانم لەسەر یەك دانەنا. دڵەکوتەم زۆر بوو. گێژو حەیران‌و زۆر شاد بووم. پێم وانیە ئیدی بتوانم بنووم، یان تەنانەت بتوانم پارووێك خواردن بخۆم. بەڵام هیوادارم تۆ ئارام بنووی. بۆ ئەوە زووتر چاك ببیتەوەو بێی بۆ لام.

کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە کە ناساخییەکەت ئەوەندە سەخت بووەو من لێت بێ‌ئاگا بووم، ئارامم لا نامێنێ.

کە دوێنێ دوکتور بۆ بەڕێکردنم تا لای کالێسکەکە هات، پێی گوتم کە سێ ڕۆژ دەستیان لێ داشۆردبووی، ئەی خوایە ئەگەر ئەوە رووی بدایە جیهانی من لەوەبەدوا بێ هەتاو دەبوو. پێموایە ڕۆژێك ـ لە داهاتوویەکی دووردا ـ یەکێك لە ئێمە ئەوی دیکەمان بەجێ دێڵێ، بەڵام هەرچۆنێك بێ ئێمە تا ئەو کاتە بە بەختەوەری گەیشتووین‌و بیرەوەریی خۆشمان لە ژیانماندا دەبێ.

دەمویست بە نووسینی ئەم نامەیە شادت بکەم کەچی ئێستا خۆم پێویستم بە کەسێکە دڵخۆشیم بداتەوە. هەرچەند گەورەترین بەختەوەری رووی تێکردووم، هێشتا لە بیرکردنەوەو دڵەڕاوکێدام. ترسم لەوەیە نەکا کارەساتێکی خراپت بۆ بێتە پێش. ئەو جۆرە فکرانە قورسایی دەخەنە سەر دڵم.

پێش ئێستە دەمتوانی کەسێکی خەمسارو بێ‌پەروا بم. چونکە شتێکی بەنرخم لە ژیاندا شك نەدەبرد کە لەدەستی بدەم، بەڵام لەمەبەدوا تا کۆتایی

تەمەنم لەگەڵ دڵەڕاوکێو نیگەرانی‌دا دەژیم. کاتێك لێم دوور بی نیگەرانم نەکا ژێر ماشینێك کەوتبی یان دارو پەدوویەك کەوتبێ بەسەرتدا، یان میکرۆبێك چووبێتە نێو لەشتەوە.

ئارامیی بیرو خەیاڵم بە تەواوی لا نەماوە. بەڵام لە بەرامبەردا تۆم هەیە. ئارامیی بێ ناوەڕۆك، واتە ئارامیی بێ‌وجوودی تۆ چ سوودێکی هەیە.

تکات لێدەکەم زوو چاك ببەوە. ئارەزووم ئەوەیە هەموو کات هاودەمی سلامەتیو بەختەوەری بی. دڵنیام زۆر زوو چاك دەبیەوە کە هەردەم لە نزیکیتدا بمو هەست بە وجوودت بکەم. نیو کاتژمێرێك لەلای تۆ بووم! وا بیر دەکەمەوە لەوانەیە خەونم دیبێ. خۆزیا بەشێك لە بنەماڵەی تۆ دەبووم. خزمێکی وەك کچە پوور یان ئامۆزا. ئەوکات هەموو رۆژێك دەمتوانی بێم بتبینمو بۆ چاك بوونەوەت بارمەتیت بدەم، کتێبت بۆ بخوێنمەوە، باڵنجەکەت بۆ رێكو پێك بکەم، وەك پەپولە بە دەورتدا بگەڕێم، زەردەخەنە بهێنمە سەر لێوەکانتو شادو خۆشحاڵت بکەم. پێم وایە ئێستا بەکەیفی. وا نیە؟ دوێنێ کە لات بووم زۆر شادو لەسەر کەیف بووی. دوکتور دەیگوت دەبێ پەرستارێکی باش بم، چونکە تۆ بە ئەندازەی دەساڵ گەنجتر دێیتە بەرچاو. چەند خۆشە عەشق دەساڵ مرۆڤ گەنجتر بکاتەوە.

ئەگەر من دەساڵ گەنجتر ببمەوەو وەك کچێکی یازدەساڵی بنوێنم، داخوا ئەو کاتەش منت خۆش دەوێ؟

چ رۆژێك بوو، تەنانەت ئەگەر تەمەنم بگاتە سەد ساڵیش ساتە خۆشەکانی ئەو نیو کاتژمێرە لەبیر ناکەم.

ئەو کچەی دوێنێ تۆی بەجێ هێشت، ئیدی ئەو کچە نەبوو کە لە "لاك ویلو"وە بەرەو ئەوێ دەهات.

خاتوو "سمپل" کاتژمێر ٤:٣٠ خولەکی بەیانی لەخەو هەڵیساندم. یەکەم شتێك کە بەبیرمدا هات ئەوە بوو:

ـ ئەمڕۆ بابە لاق درێژ دەبینم.

لە چێشتخانە، لەژێر تاریکورووونی شەمدا چاییم خوارد. پاشان پێنج میل بە سواریی گاریە رۆشتم تا گەیشتمە وێستگەی شەمەندەفەر. یەکێك لە بەیانییە شادیبەخشەکانی مانگی ئوکتۆبر بوو.

لەنێو رێگادا بووم کە رۆژ هەڵات.

رەنگە نارنجیو ئەرخەوانییەکان، لەسەر شەونمە سەهۆڵ بەستووەکان رەنگیان دەدایەوە.

هەوا سازگارو خاوێنو لێوانلێو لە مژدەو هیوا بوو.

هەستم دەکرد رووداوێکی چاوەڕوان نەکراوم لەپێشە.

بە درێژایی رێگا وام دەزانی دەنگی شەمەندەفەر ئەوە دووپات دەکاتەوە" ئەمرۆ بابە لاق رێژ دەبینم". ئەوە ئارامی دەکردمەوە. ئارامییەکی وا کە هەموو ئاستەنگەکانی لێ دوور خستمەوە. ئەوەندەم بڕوا بە ئەقڵو زانایی بابە گیانم هەبوو، کە دڵنیا بووم دەتوانێ هەموو کارەکانم بۆ رێكو پێك بکا. بەڵام ئەوەشم دەزانی کە لە شوێنێکی دی لە جێگایەکی دوورەدەست پیاوێکی ئازیزتر لە بابەم، لە ئارەزووی دیداری من دایە. کاتێك گەیشتمە بەر درگای ئێوە لە شەقامی "مەدیسۆن"[1] لە دیتنی ئەو کۆشکە گەورەو بەشکۆ قاوەییە، لەوانەبو لەخۆم ببمەوە. بۆ ئەوە هەندێك بەسەر خۆمدا زاڵ بم. دەورێکی کۆشکم دایەوە.

---

[1] Madison

بەڵام نیگەرانیی من لەجێی خۆیدا نەبوو، چوونکە خزمەتکار، پیرە پیاوێکی خوێنشیرین بوو بە شێوەیەکی ئەوەندە میهرەبانانەو باوکانە لەگەڵم دوا کە بە تەواوی ترسم لا نەما.

خزمەتکار لە حاڵێکدا زەردەخەنە بەسەر لێویەوە بوو بە دەنگێکی میهرەبانانە لێی پرسیم:

ـ تۆ خاتوو جیرۆشا ئابوت"ی

من بە نیشانەی ئەرێنی سەرم بۆ لەقاندو ئیدی پێویستیی بەوە نەبوو کە ناوی بەرێز "ئیسمیت" بێنم. پێشخزمەت پێی گوتم چەند ساتێك لە هۆڵدا چاوەڕوان بم. هۆڵێکی لەرادەبەدەر شکۆدار بوو. بە دڵە راوکێوە لە کاناری یەکێك لە قەنەفەکان دانیشتم. دڵم بە توندی لێی دەدا، لەبەر خۆمەوە دەمگوت: "ئێستا بابە لاق درێژ دەبینم".

لەو کاتەدا خزمەتکار گەرایەوەو گوتی: "تکایە تەشریف بێنە بۆ کتێبخانە". وەها تووشی ترسو نیگەرانی ببووم کە بەگران دەمتوانی بەسەر پێوە خۆم راگرم. لە نزیك دەرکی کتێبخانەدا کەمێك راوەستاوو گوتی: "ئاغام زۆر بە سەختی ناساخ بووەو ئەمڕۆ یەکەمین رۆژە دوکتور ئیزنی داوە دابنیشێ. هیوادارم زۆر نەمێنیتەوەو ماندووی نەکەی". بە قسەکانیدا دەرکەوت تۆی زۆر خۆش دەوێ. هەر بۆیە لە دڵی مندا جێگایەکی بۆ خۆی کردەوە، پاشان بە قامکی لە دەرکەی داو گوتی:

خاتوو "ئەبوت"

من پێم نا ژوورەکەوە. دەرکە پێوە درا. ژوور زۆر زۆر رووناك نەبوو. لە رووناکیی توندی دەرەوە لەناکاو چوومە ئەو ژوورە تاریکە. لە پێشدا جێگایەکم نەدەدی. وردە وردە بەرچاوم روون بۆوەو قەنەفەیەکم لە پەنا زۆپایەك دا بەدی کرد کە

مێزێكی چایی خواردنی بریقەدارو كورسیەكی بچووكیان لەپەنایدا دانابوو.

پیاوێكم دی لەسەر قەنەفە دانیشتوبووو پاڵی دابوو بە چەند باڵنجێكەوەو لاقەكانیان بە بەتانی داپۆشیبوو.

پێش ئەوە شتێك بڵێم پیاوەكە بە لەش و لارێكی لەرزۆك لە جێگاكای هەستاوو بۆ ئەوە بتوانێ بە پێوە راوەستێ دەستی گرت بە پشتی قەنەفەكەوە. بێ ئەوە تەنانەت یەك وشەم لەگەڵ بدوێ، لێم ورد دەبۆوە.

ئەو كاتە بوو كە دیتم ئەوە تۆی. گێژ ببووم. وام دەزانی بابە لاق درێژ ناردوویە بەشوێن تۆدا كە لەوێ من ببینی. تۆ بە پێكەنینەوە دەستت بۆ راداشتمو گوتت:

ـ "جودی"یە بچكۆلەی خۆشەویستی من. هیچكات هەستت بەوە نەكرد كە بابە لاق درێژ من بم؟

هەموو شتێكم بۆ روون بۆوە. خوایە من چەند گێژو ساویلكە بووم. ئەگەر تۆزقاڵێك بمناورزابا هەزار كەڕەت پێش هاتبوو كە ئەم نهێنییەم لێ روون بكاتەوە.

من هەرگیز ناتوانم ببم بە پۆلیسێكی باش بابە ... "جروی".

نازانم لەمەبەدوا چۆن ناوت بێنم. تەنیا گوتنی "جروی" دوور لە ئەدەبەو ناتوانم سەبارەت بە تۆ بێئەدەب بم.

بە هیچ كلۆجێ نەمدەزانی چی بكەم. لە خۆشیان دەمویست بزریكێنم، بەڵام گەرووم گیرابوو.

نیو كاتژمێرێكی زۆر شیرین بوو، بەڵام زوو تەواو بوو. دوكتور هاتو پێی گوتم كە ژوورەكە بەجێ بهێڵم. كاتێك گەیشتمە وێستگەی شەمەندەفەر ئەوەندە گێژ بووم كە خەریك بووم بە هەڵە سواری شەمەندەفەری "سن لوئی" بم. تۆش وەزعت زۆر لە من باشتر نەبوو. تەنانەت لەبیرت چوو ئستیكانێك چاییم بۆ داوا

بکەی. بەڵام هەردووکمان بەختەوەرین. وا نیە؟

تاریکان داهاتبوو کە گەیشتمەوە "لاك ریلو". ئەستێرەکان چەند جوان دەزریوانەوە. بەیانیی ئەمڕۆ چووم بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کە لەگەڵ تۆ چووبووم. دەمویست ئەوەی کە تۆ کوتبووت وەبیری خۆمی بێنمەوەو بەو جۆرە لە ژیان بڕوانم کە تۆ لێت دەڕوانی. ئەمڕۆ هەوای لێرەوار خۆرە مردوو بوو. ساردو سەهۆڵبەستوو. ڕۆژ ڕۆژی پیاسە بوو. پێم خۆش بوو تۆش لێرەبای و پێکەوە روومان لە تەپۆڵکەکان کردبا.

"جروی" خۆشەویستت! کاتێك بیر دەکەمەوە کە لە نامەکانم دا بە راشکاوییەوە ئەوینی خۆم لای بەڕێز "جروی"درکاندووەو ئەو دەردە دڵانەم لای بابەم کردووە، لە شەرمان لەوانەیە ببم بە قەترەیەك ئاو. بەڵام لەو حاڵەشدا دەبینم بێجگە لەوە چارەیەکی دیکەم نەبوو. ئەگەر بەو جۆرە نەبوایە مەسەلەکە بە ئاڵۆزی دەمایەوەو لە گەورەترین بەختەوەری بێبەش دەبووم.

بەڵام ئێستی تۆم هەیە. تۆیەك کە ئازیزترین باب بووی، هەموو شتێکت پێشکەش بە من کرد، ئاخریەکەشی "جروی" خۆشەویست بەو ئەوینەی کە پێت بەخشیم بەختەوەریی منت گەیاندە ئەوپەڕی خۆی و ئەمەش قەرەبووی ئەو هەموو شەرمە دەکاتەوە.

"جروی" ئازیزم زۆر دڵتەنگم و یادت دەکەم. دیارە ئەمە بەختەوەرانەترین شێوەی دڵتەنگی یە.

ئێمە بەم زووانە پێکەوە دەبین.

ئێمە لەمەبەدوا راست و دوور لە پێچوپەنا پێوەندیمان پێکەوە هەیە.

داخوا سەیر نیە کە ئێستا من کەسێکم هەیە؟

ئەم رووداوەم زۆر زۆر شیرین دێتە بەرچاو.

هەرگیز ناهێڵم تەنانەت بۆ لەحزەیەك زویرو وەڕەز بی.

بەناچار دەبێ کۆتایی بە نامەکەم بێنم. چونکە دەترسێم فرمێسکەکانم کاغەزەکە تەڕ بکا. فرمێسکێك کە لە رازی بوونو خۆشەویستییەوەیە، نەك لەڕووی خەمبارییەوە.

ئەو کەسەی بەوپەڕ پەرۆشییەوە چاوەڕێی چاکبوونەوەو دیدارتە.

"جودی"

- پەراوێز:

ئەمە یەکەمین نامەی دڵدارییەکە کە لە ژیانمدا نووسیومە. سەیر نیە ئێستا من بە هەموو شتێك ئاگادارم.

سپاس بۆ شاعیرو، نووسەرو وەرگێڕ مامۆستا عاشق کە بە نووسراوەکەدا چۆوەو بە گۆڕانی هەندێك وشە وەرگێڕانەکەی دەوڵەمەندتر کرد.
سپاس بۆ کاك ئازاد موسلم، کە لە دابەزاندنی وێنەکانی نێو کتێبەکەدا یارمەتیدەرم بوو.



## وەرگێر لەچەند دێڕیکدا :

- ئەنوەر سوڵتان پەنا کوڕي ئاغاسالحی ڕەنگەڕێژان لە یەکێ لە بنەماڵە گەورەکانی شاری سەقز لە ساڵی ١٩٣٥ی زایینی لە گوندی تاڵەجاڕی سەرشیوی سەقز لەدایک بووە
- لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینی لە تەمەنی ٤ ساڵیدا بە هۆی زوڵموزۆری ڕەزاشا ( شای وەختی ئێران ) ناچار بوون کە لە زێدی باو و باپیرانیان هەڵبکەندرێن ، سەرشیو بەجێ بهێڵن و لەگەڵ بنەماڵەکەیان ڕوو بکەنە شاری سلێمانی و لە لای شێخی نەمر ( مەلیک مەحموود ) گیرساونەتەوە زیاتر لە دوو ساڵ لەوێ ماونەتەوە
خوێندنی باخچەی منداڵان و یەکی سەرەتایی لە شاری سلێمانی تەواو کردوە
- پاییزی ساڵی ١٩٤١ گەڕاونەتەوە سەشیوی سەقز و گوندی تاڵەجەڕ تا تەمەنی ١٤ ساڵی مامۆستای تایبەتی بووە دوایی لە

حوجرەی مزگەوتی تاڵەجەر ماوەیەک بە خوێندنی سەرف و نەحوی عەرەبی سەرقاڵ بووە
-ساڵی ١٩٥٧ پەیوەندی کردووە بەحیزبی دیموکراتی کوردوستانی ئیرانەوە

کۆتایی ساڵی ١٩٦٢وسەرەتای ساڵی ١٩٦٣ لە شالاوی گرتنی ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەردەکەوێت و بەند دەکرێت . نزیک بە ساڵێک لە بەندیخانە دەمێنێتەوە و پاشان ئازاد دەکرێت .
ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ شۆڕشی گەلانی ئێران چالاکیەکانی لە ڕیزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەستپێکردووەتەوە.

ئێستاش زیاتر لە ١٧ ساڵە لە وڵاتی نورویژ نیشتەجێیە